

# شەوارە

(کۆمەڵە چیرۆک)





مەلا کەریم سارده کۆسانی (ڕاوچی)

کۆکردنەوە: کاوە عەزیزنژاد



ماموستا راوچی

خەڵکی تەلان و تەرت و سوێم — خـونـچەی نەدێراوم لە دێـم

شەرت و مەرجم تێکناشکێ — لەتلەت کرێـم بۆ گوڵ دەدوێم

# شەوارە

مەلاکەریمی ساردەکۆسانی

کۆکردنەوەی: کاوە عەزیزنژاد



بڵاوکەرەوەی کولەپشتی
١٣٩٣

| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | عزیزنژاد سارده کوسانی، کریم، ۱۳۰۵ - ۱۳۸۰. |
| عنوان و نام پدیدآور | : | شەواره / مەلاکەریمی سارده کوسانی؛ کاوەی کوریراوچی. |
| مشخصات نشر | : | تهران: کوله پشتی، ۱۳۹۲. |
| مشخصات ظاهری | : | [۱۵۰] ص.: مصور. |
| شابک | : | ۷۰۰۰۰ ریال : ۹۷۸ـ۶۰۰ـ۵۸۱۶ـ۴۴ـ۰ |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی |
| موضوع | : | داستان‌های کردی -- قرن ۱۴ |
| شناسه افزوده | : | راوچی، کاوه، گردآورنده |
| رده بندی کنگره | : | PIR۳۲۵۶ ۱۳۹۲ ۴ع۷۴۵س/ |
| رده بندی دیویی | : | ۸فا۲۳/۹ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۳۱۵۱۴۵۷ |





**شەواره**

**چیرۆک و پەخشان**

نووسەر: مەلاکەریم عەزیزنژاد (ڕاوچی)

کۆکردنەوە: کاوە عەزیزنژاد

پیتچن: م. شاسەنەم، ع. جەوشەنی

ڕووبەرگ: داود محەمەدکەریمی

بڵاوکەرەوە: «کولەپشتی» ـ تاران

شابەک: ۹۷۸-۶۰۰-۵۸۱۶-۴۴-۰

نۆرەی چاپ: یەکەم، ۱۳۹۳

ئەژمار: ۱۰۰۰ دانە

نرخ: ۷۰۰۰ تمەن

# نێوەرۆک:

## یادی ڕاوچی

فەتاح ئەمیری

پاش دەرچوونی «هاوارەبەرە»ـ ساڵی ١٣٦٩ی هەتاوی ـ نامەیەکی جوانم پێ گەیی. ئەوێدەمێ هێشتا بەرەو پیری نەڕۆیبووم. مێشک و دەمارم هەروەک ئێستاش کەمێکم تێدا ماوە تینووی واژەی ڕەسەن و تیفتیفەدراوی کوردی بوو. بە بڕوای منی هەڵوەدای واژە، واژەی جوان، ڕستەی باش پێکدێنێ و ئەو ڕستە، تێکەڵاوی ئیستلاحی ڕەسەن، دەبنە هۆی بەدیهاتنی فەرهەنگی دەوڵەمەند کە ئاواتی هەموو خاوەن قەڵەمێک و خوێندەوارێکە.

نامەی گۆرین، بۆنی میسک و عەنبەری لێ دەهات. بۆن و بەرامەی بەیبوونی دەدا، ڕەنگی هەڵاڵە بوو، هەڵاڵەی نواڵەی کوێستان، کوێستانی زیندووی بە پێوە ماوی سەرما و سۆڵی زستان. وێنەی گیابەندی لە بەند دەرچووی قەڵەشی بەردی پەنای تاشەبەرد، گیابەندی ئامێز داگرتوو بە گیاخاو.

نامەکە، نامە نەبوو، مێخەک، عەتر، بۆنی وەنەوشە، شکڵی مێلاقە، وێنەی شللێرە، چەپکێک قورینگان و گوڵەزەرد و هێرۆ و قەیاخ بە ڕیحانە و جاترە پێچرابوو.

نامەکە، بەرهەمی سەدان شەو و شەونخوونی، شەوارەی دەیان پەنا و پەسیو و بنە و سیپەی مێرۆژ و سیاسووت، نێچیری سەردەمی لان و کۆنەلان، شوێن و دوورەبازد و هەزار و دوولایی بوو.

ڕاوچی سارده‌کۆستانی، وه‌کی من ئاگادار بم، بن‌له‌هجه‌ی گه‌ورکی موکری به ته‌واوی ده‌زانی، ناوی سه‌دان گیاوگژ و گوڵ، جێگای شین بوونیان، شکڵی گه‌ڵا و گوڵیان، کاتی گوڵ کردنیان، ئه‌سه‌ری ده‌رمانی ئه‌و گیایانه و...

شێعری جوانیٚ هه‌بوو، ناسک خه‌یاڵ بوو، په‌خشانی دڵگری ده‌نووسی، به‌ڵان ده واژه زانیندا، به‌تایبه‌تی واژه‌ی ڕه‌سه‌نی به‌شی گه‌ورکدا پێم وا نییه که‌س شوێنی شکاندبێ. ئه‌و مه‌زنه پیاوه، مه‌لا بوو، ده‌رسی به عه‌ره‌بی ته‌واو کردبوو، مه‌لایه‌تی کردبوو، فه‌قێی ئیجازه دابوو، که‌چی هێندی نووکه ده‌رزییه‌ک، زبانی عه‌ره‌بی ئه‌سه‌ری له سه‌ر کوردییه‌که‌ی نه‌کردبوو.

زۆروو ده‌ردی‌سه‌ر نه‌ده‌م، ئه‌وانه‌ی من له سه‌ر ماموٚستا ڕاوچی باسم کردن، مێوژێکن له که‌ویژێک. نامه‌ی گۆڕین، گێژ و مه‌نگی کردم، پاش ده‌رچوونی هه‌وه‌ڵ کتێب، نامه‌ی جۆراوجۆری دیکه‌شم پێ گه‌یبوون، به ڕازی و ناڕازییه‌وه، ئه‌مما نامه‌ی ڕاوچی تام و چێژێکی دیکه‌ی هه‌بوو، نامه نه‌بوو، واژه‌نامه بوو، به کوردی بیر کردبۆوه و به کوردی ڕه‌سه‌نی نووسیبوو.

به شوێنیدا ڕۆیشتم، له شه‌قامی سه‌قز ده باڵه‌خانه‌یه‌کدا ددان‌سازی هه‌بوو، ده‌رگا ئاوه‌ڵا بوو، چوومه دیوی چاوه‌ڕێ بوون، که‌سی لێ نه‌بوو، له هۆده‌یه‌کی په‌نا ئه‌و، هاژه و خرته‌ی ده‌هات، دیار بوو کارێکی به ده‌سته‌وه‌یه. سه‌برێکی دانیشتم، ماوه‌یه‌ک پێ چوو، سه‌رێکی ده ژووریٚ نا، هه‌ستامه پێ، پیاوێکی قه‌د بارێک، گه‌ڕاوه و خوێن شیرین، به چاویلکه‌وه؛ نه‌ده‌کرا بڵێی پیره و کامڵی ده‌نواند. سڵاو و چاک و خۆشی، سه‌ری هه‌ڵێنا:

ـ کاکه ددانت ژان ده‌کا؟

ـ نه‌وه‌ڵڵا ماموٚستا. سه‌رم!

ـ خۆ من حه‌کیم نیم؟!

ـ قوربان من فه‌تاحم، ئه‌و که‌سه‌ی نامه‌که‌ت بۆ ناردووم.

ئامێزی پێدا کردم، بە گەرموگوڕی وەری گرتم، بەم جۆرە بووینە ئاشنا و جارجار هاموشۆشمان هەبوو.

مامۆستا زۆر قسە خۆش بوو. ساڵێکی ماڵی لە گوندی دەروێشان بوو، خەبەرم پێ گەیی ناساغە، دەگەڵ برادەرێکی چووینە دەروێشان، بە جێ و سەنیر کەوتبوو، کەمێکم دڵخۆشی داوە:

ـ ئەتۆ شوکر بەئیمانی، مەلای شاوەدانیی و پێش‌نوێژی خەڵک دەکەی، موسوڵمان بەڵای بە سەر دێ، خوای گەورە، دەرد دەدا و دەرمانیش دەدا، فەرموو ئەوە ماشێن با بچینە بۆکان.

هەستابووە سەر جێگاکەی دانیشتبوو. گوتی:

ـ نەوەڵڵا بەرەو چاکیم. با قسەی خۆش ون نەبێ. دوو ڕۆژ لەوەی پێش، نۆبەتێ ئەمانی نەدەدام، وەک تەندوور داییسام، مەلاژن پەیتاپەیتا بە ئاوی شیلەوگەرم قاچوقولی دەشوتم، دەسرەی تەڕی لە سەر سەرم دادەنا و لە بەرەوە دڵخۆشی دەدامەوە: «پەرۆش مەبە، ئیشەڵڵا چت لێ نایە، هەرچەن مان و نەمان بە دست خوایە، ئەوەی بزانە پاشی تۆ منداڵان دەگەینمێ، بە خوای پێت وا نەبێ ئافرەت و دەستەوستانم، دەتوانم ئاو لە بەرد بێنم.»

سەبرێکی گوتم: «دەی خۆ من بەردیش نیم، ئەگەر ڕاست دەکەی ئاو لە من بێنە.»

مامۆستا ڕاوچی دەسکری خوا و پەروەردەی کێو و تەلان، بەرڕۆژ و نیسار، گەوە و لاپاڵ، ڕەوەز و زەرد و ماە و ئاسۆ و گۆڕەپان بوو. وەک کوێستان ئەگەرچی سەر بە تەم بوو، بەڵام سەری بۆ کەس دانەنەواند، لە ڕەوتی ژیانی، ڕاوی بەتاڵ نەکرد و بە دەم ڕاوەوە ڕاوێژی ڕەسەنی کوردی بە کار هێنا.

ڕۆژێکی لێم پرسی: مامۆستا هێندێک باسی دڵداری سەردەمی لاویت ناکەی؟

هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا، مژێکی لە جگەرەکەی دا، کەمێکی سەر لەقاند، بێدەنگ بوو، وەک چووبێ دە ناخی ڕابردوویەکی دوورەوە. وەک گەڕابێتەوە سەردەمی لاوی، لە ژێر چاویلکەکەیەوە سیلە و چەفتەی لە خاڵێکی دووری ژیانێ گرتبوو. ئەو خاڵە، کۆترەباریکەیەک بوو لە چەشنی شەوارەی شەوگاری لاویدا بۆی نەگیرابێ.

چاوێکی خەمباری لێ کردم: «چۆن بوو ئەم پرسیارەت لێ کردم؟»

عەرزم کرد: «شێعر و پەخشانەکانت زۆر بەسۆزن، پێموایە بەرگی مەلایەتی و ئەدەبی کوردەواری ڕێگای نەداوی ئەوەی دە ناخڵی دڵتدا قەتیس ماوە، تەنانەت بۆ تاکەکەسێکی وەگێڕی، پێم وایە بێتوو بۆ منی بلێی، لەشت لە دەس بارێکی گران دەحەسێنیەوە و سووک دەکەی.»

گوتی:

بەسەرهاتێکی سەیرت بۆ دەگێڕمەوە. بەو شەرتەی تا من ماوم لە لای کەس نەیدرکێنی. ئیدی پاشان کەیفی خۆتە، ئەو نەقڵە ئەمانەتێک بێ لە لای تۆ. من بە لاوی و بە پیاوی و بە پیری، هەرگیز بە لای بێ‌ئەدەبیدا نەڕۆیشتووم، تەنیا جارێکی دە ماوەیەکی دوور و درێژدا، دڵداریم بە خەون کردووە.

فەقێ بووم، شەوێکی لە حوجرە خەونم بە کیژێکی شەنگ و شۆخ و دەستەی، شیرین و مەزەدارەوە دیت. تەنیا خەون بوو، مافی بە سەر سەردەمی لاوی و بلووغ و ئەوانەوە نەبوو. خەونی دڵداری دەگەڵ کچێکی ڕەزاسووک، بەبێ دەستەکوتە و ڕامووسان و بەبێ شەقە و مژین و کوشین. هەر خۆشەویستی و حەز و داخاز. ئەو خەونە زۆربەی شەوان هەر هات و دووپات بۆوە، هەر لە سەر ئەو ڕوخسار و شوێن و قەرارەی پێشوو، نەمدەزانی ناوی چییە و کچی کێیە و خەڵکی کام گوندە،

کەچـی هەردووکمـان یەکترمـان بە ئەوپەڕی ڕادەوە خـۆش دەویسـت و خۆش دەویست.

فەقێی ئەویندەمی بۆ بژێوی خۆیان ڕاتبەیان دەکرد، گونداوگوند دەڕۆیشتن، هەرچی وەدەستیان هێنابا، لە حوجرە سەرف دەبوو، ڕووم دە گوندێکی گەورە کرد، لە دەرگای ماڵێکم دا، هەرای ڕاتبەی فەقێیانم کرد، کیژی گۆرین، کیژی خەونەکانم، ئەوەی لە گیانم خۆشتر دەویست، دەرگای لێ کردمەوە. ئیدی زبانم دە بەست چوو، هێزی ئەژنۆم شل بوون، سەرم دە گێژەوە هات، چاوم ڕەشکەوپێشکە و تارمایی دەکرد و جەستەم وەک بینی ئاو دەجووڵاوە.

کچە دە پێش مندا وەخۆ هاتەوە، بزەیەکی هاتێ و گوتی: «مەلاکەریم ئەوە بۆ واق ماوی؟»

گوتم: جا ئەگەر دەزانی "مەلاکەریم"م، دیارە دەشزانی لە سەر چی وام.

لێک ئاشکرا بووین، ئەویش بە خەون منی دیبوو، تەنانەت ناویشی پرسیبووم. زۆرمان ڕاز و گلەیی کرد و پێک شاد و شوکور بووین، بەڵێنیم پێدا دەگەڵ خوێندنم تەواو کرد بنێرمە خوازبێنی.

ماوەیەک گوزەرا. من بۆ ئیجازەنامە چوومە شوێنێکی دیکە و لێک دوور کەوتینەوە. پاشان سەرێکی ماڵی خۆمانم دا و خەریکی تەدارەکی خوازبێنی بووم، زەمانی شای بوو، بگیربگیر پەیدا بوو، دەوڵەت دەستی کرد بە خەڵک گرتن. من لە خۆم بەشک بووم، دەگەڵ هێندێک لە برادەران ڕامانکردە دیوی گەرمێنی و لە گوندی سۆنێ، بنکەیەکمان پێکهێنا.

له دەزگیران بێخەبەر مامەوە. ڕۆژێک له گوندێکی دەوروبەری بنکە، خەریکی کارێک بووم، له ماڵێکی تر لەو گوندە تووشی کچە بووم، زۆر بە دڵشکاوی لۆمەی کردم.

من تەواوی نەقڵی ئەو ماوەیەم بۆ گێڕاوە و دڵخۆشیم داوە و گوتم: «ئەگەر شووت نەکردووە، هەرچەند چم بە دەستەوە نییە، بەڵام جێبەجێ دەکرێ. دەچمەوە بنکە و بەم زووانە دەنێرمە سەر بەرە.» داخی گرانم بە چوونەوەی من بۆ بنکە، خەبەریان پێداین دەبێ بڕۆین بۆ شوێنێکی دوور و شەپکە توندە و ئاگامان لە خۆ بێ.

دیسان دەگەڵ کچە بە ناچاری لێک هەڵبڕاین و بە تەواوی لێک پساین. پاش چەند ساڵێک من ژنم هێنا و ماڵم پێکەوە نا و بووم بە مەلای گوندی. دیسان ماوەیەک پێ چوو، وەک بارووت قاچاغ بووم و ڕامکردەوە دیوی گەرمێن، سەرلەنوێ بە هەڵکەوت تووشی کچە هاتمەوە. ئەوجارەیان شووی کردبوو. تەڵاقی وەرگرتبوو. دیسان پاش ڕاز و گلەییی زۆر، قەرارمان دانا و سەرلەنوێ پەیمانی دڵداری و هاوبەشی دیاری کرا. بە داخەوە داری بڕیایان سەرەوبن دەڕوێ، شەڕەشەپی ڕۆژگار ئەمانی نەدام و بۆ دایمە لەو کیژە نازەنین و بەشەرم و حەیایە دیدار ئاخر بووم. ئێستاش کە نازانم ماوە یا مردووە، دە بیری مندا هەر جوان و خۆشەویستە و تا ئاوێلکەی مردن بە ئاواتیەوەم.

ئەو کورتە بەسەرهاتە بەشێک لە دڵداری ئیفلاتوونی مامۆستا ڕاوچی، پێم حەیف بوو ئاوە بە کورتی عەرزوو نەکەم. دەمزانی ڕەنگە بۆخۆی لە ڕووی هەڵنەهاتبێ، سەرەڕای ئەو هەموو پاکییە، باسی بکا.




زۆر بەختەوەرم کاک کاوەی کوڕی مامۆستا ڕاوچی، قۆڵی لە کارەکانی باوکی هەڵماڵیوە و خەریکی کۆ کردنەوەیانە، بە ڕوونی ئەو ئاواتەم دێتە دی کە میللەتان هەرگیز نامرن، هەرگیز ئەستێور و وەجاخکوێر نابن.

بۆکان ـ ١٣٨٩/٥/٣ی هەتاوی

# شەوێک و خەوێک[1]

محەمەد ڕەمەزانی

شەوێکی خۆشی هاوین بوو.[2] دەگەڵ خوالێخۆشبوو مەلاکەریم لە ماڵی خزمێکی سەبەبیی هەردووک لامان میوان بووین. پاش شێو کردن لە بەرهەیوانێ دانیشتبووین. دوو بە دوو بە مەشکە چاییمان دەخواردەوە. لە زۆر بابەتان دواین. لەو کەسایەتییە بلیمەتەدا نەک مەلایەکی ئاسایی، بەڵکوو تێکەڵاوییەک لەو شتانەم دەدی: کۆنە شۆڕشگێڕێکی ئازادیخواز، ئەدیبێکی هەستیار، شاعیرێکی تووڕە و زیز، کوردێکی ژیری ژێرچەپۆکەی زردایکی مێژوو، مرۆیەکی بەئەزموونی تاڵی و سوێریی چەشتووی گەرمێن و کوێستان کردووی لە کڵ دەرهاتوو، بە گومان لە هەموو چەشنە بیر و بڕوا و تەنانەت لە بیر و بڕوای شێوەئایینی، باڵوولیی قسەزانی، تەنانەت بە قسەی گورچووبڕ (بۆخۆی دەیفەرموو: من زمانم پیسە، بەڵام دڵم خاوێنە)، هەرواش بوو، ڕاست وا بوو، یانی لە هەموو زەمان و یاسا و دەسەڵات.

قومی توندی لە جگەرە دەدان و باسی شێعرەکانی دەکرد: «دەفتەرێکم هەیە لە پشت سەرمی دادەنێم. ڕەمەزانی، بڕوام پێ بکە جاری وایە سەعات لە سێی نیوەشەو شێعر هورووژم بۆ مێشکم دێنێ، وەک شێتان لە جێوبانی دەردەپەڕم، چرا هەڵدەکەمەوە و دەینووسم.» گوتم: «وا بزانم ستانسلاڤیسکی شانۆگەری مەزنی ڕووس دەڵێ: "هونەرمەند دەبێ وەک منداڵان بەنەشە بێ،

---

[1] ئەو عینوانەم بە دانستە لە کتێبەکەی مامۆستا نووری خواستۆتەوە.

[2] یەکێ لە ساڵەکانی ۱۹۹۱ تا ۱۹۹۳ی زایینی.

دڵێکی ژنانەی بێ و مێشکی پیاوانە. "مـن ئەو تایبەتمەندییانە لە جەنابتدا دەبینم. تۆ بە جەستە پیری، بەڵام بە دڵ و دەروون گەنجێکی شازدە حەڤدە ساڵیی. » پاشان بە پێکەنینەوە گوتم: «شێوازی جلوبەرگ پۆشینیشت هەر وەک جحێڵانە و ماشەڵڵا قیتوقۆز و دڵتەڕی. »

گوتی: «بەوەڵڵا ڕەمەزانی، ئێستاش کە ڕیشم دەتاشم و خۆ تاس و لووس دەکەم و جلوبەرگی جوان و بۆشناغ لە بەر دەکەم، هەر بۆ وی و بە یادی وییە!»

گوتم: «بە یادی کێ؟» لە نێو قەندانەکەدا قامکی بەتاڵووکەی کەوتە پشکنین، دەتگوت بۆ کلۆقەندێ دەگەڕێ کە لە شەکری هەموو دنیا شیرینتر بێ و نایەفتتر لە هەنگوینی شەمەترووکە، بۆ وەی ڕۆژانی بەژانی ناکامیی پێ شیرین کا. ئیستیکانە چایەکەی بە هەڵەداوان خواردەوە وەک ئەوەی بخوازێ ڕێوبانی گەروو وا خۆش کا کە وشەی پڕسۆز و نەرمونیان بێ سەرەنگرێ بێن و بڕۆن:

«تەڵەبە بووم لە گوندێ .... تەمەن شازدە حەڤدە ساڵ. شەوێکیان خەونێکم دی. ساڵێکم بە خەو دی، یەک ساڵی تەواوم بە خەوی دی! ئەلحانیش کە بیری ئەو شەوەم بە خەیاڵدا دێتەوە، مچوڕک بە ئازای ئەنداممدا دێ، وەک تەزووی کارەبا!

لە خەونمدا دەگەڵ هێندێ لە دۆست و برادەران بووم، چەکمان لە شاندا بوو. زۆر ڕۆیشتین گەیشتینە قەراغ دێیەک. لەوێندەرێ پارچەیەکی زەلامی سپی ڕاخرابوو. بە گوڵدۆزیی لە سەری نووسرابوو: بەخێر بێن بۆ گوندی فلان، هەروەکی کە لە نزیک هەر شارێک تابلۆی بەخێراتن دەبینی. چووینە نێو دێ. بە کۆڵاناندا و بە پەنای کانییەکەدا تێپەڕین، کوڕێک بەرەو پیرمان هات،

بردمانییە ماڵێ. هەستم نەدەکرد خەوە. تەواو بەڕاستم دەزانـی. لە هـۆدەیەکی زەلام بە دەورە دانیشـــــبتووین، جەفەنگمـــــان لـــێ دەدا. هەمـــوو لە دڵەوە پێدەکەنین. لەو جەنگەیەدا کچێکی جـوانی بـاڵابەرزی کـاڵوکرچ تیشـکەڵانە، مەمک قوت، چاو سەوز وەژوور کەوت. بە دەوری کۆڕەکەدا دەهـات، دانە دانە مەرحەبایی دەکردن. کوڕان شۆخییان دەگەڵ دەکرد. جوابەجەنگێی دەکـردن، ڕووهەڵماڵدراو بوو، بەڵام ئەسڵەن بێشەرم نەبوو. دەترسام نۆرە بگـاتە مـن. لە خۆم ڕانەدەدی لەگەڵی بدوێم، چ دەگا بەوەی گاڵتەی لەگەڵ بکەم. دەمگـوت یان دەحەپەسێم و قسەم بۆ نایە، یـان کەلیمەکـان خـاو و خلیسـک، گـۆج و ئیفلیج بە دەممدا دێن و لە بەردەمی دەکەون. ئەویش بە بێزێکەوە مـۆرەیەکم لێ دەکا و ماڵبوێرم دەکا. منی هەناسەساردا نـاڵێم نـاحەز بـووم، قیـتوقۆز و جوانچاک بووم. بەڵام من لە سەر ڕوخـی زەوی و ئەو لە حەویقـی ئاسـمان! هات لێم نزیک بۆوە. بە پێکەنـین و ڕووگەشـییەوە گـوتی: سـەڵام مامووەسـتا گیان! تا ئێستا کەس پێی نەگوتبـووم مامووەسـتا، هەر پێیـان دەگـوتم: فەقـێ کەریم، یـان هەر فەقـێ و هیچـی دی. سـێحری ئەو چەنـد وشـەیە (سـەڵام مامووەستا گیـان!) وشـکی کردبـووم، قسـەم بـۆ نەدەهـات. ئەو بە پێـوە، مـن دانیشـــتوو. چـاوی لە چـــاوم بـــڕی، نیگـــای تێکەڵاویـــیەک لە هەوەس و خۆشەویستی. لەو جەنگەیەدا نەمدەزانی بە کام باریاندا دەشکێتەوە. بە سەرمدا چەماوە. قژی زەردی وەک خەزێنەی زێڕ بە سەر سـەرمدا ڕژان و بە شانمدا شۆڕ بوونەوە. دەموچاوم لە سینگ و مەمکـی نەرمونۆڵیـدا بە جـاری ون بـوو. هەمو ئەو شتانە چرکەیەکی پێ نەچوو. ئەو چـرکەیە لە هەزاران سـاڵ مـاچ و مووچ درێژتـر بـوو، بەلەزەتتـر بـووا کە هەسـتاوە لە سـەرم، منـیش بێئاگـا قرچەپێ هەستام. تماشام کرد هاواڵەکانم دیار نین، هۆدەیەکیان چۆڵ کردبوو.

دەممان لە نێو دەمی یەکتری نا. بەو حاڵەوە وەدەرکەوتین. دەستی نەرمونۆڵی، دەستی دەکوشیم و بە پلیکاناندا داگەڕاین. چ هەستم بە قورسایی لەشم نەدەکرد، هەستم دەکرد بەری پێمان بستێک یان نیوەبستێک لە عەرزی جودا بۆتەوە دەفڕین.

لە سەر کانییەکە بووین. شەرم و شکۆمان لەو هەمووە کچ و ژنە نەدەکرد کە گۆزە و جەڕە بە دەست ئاویان دەبرد، یەکتریمان ماچ دەکرد، ماچی ورد و درشت.

شەو بە سەردا هاتبوو، لە کۆنە چارداخێکی کە کەوتبووە لای باکووری دێیەکە، دانیشتووین. تۆزێک ڕووخەک ببوو. حەسیرە شڕێک و ڕایەخێکی کۆنی تێدا بوو، هێنامانە دەرێ تەکاندمان. پێمەڕەیەکی کەتی دەسکقوڵە لە بەر دەرکەکە لە دیوی نێوەوە هەڵپەسێردرابوو، دەستم دایە و خۆڵ و ورکەبەردی تەرکی عەرزەم دەردا دەرێ. ئەو کێژە جوانە گەسکە کۆتەرەیەکی بە دەستەوە بوو. دەیویست تەرکی عەرزەکەی پێ بماڵێ. نەمهێشت. گوتم: «بە قوربانت بم، گووجەی دڵم، چۆنم دڵ دێ گوڵی وەک تۆ گڵ و خۆڵی لێ بنیشێ!» گەسکی فڕێ دا بە تامەزرۆییەوە باوەشی پێدا کردم. دەستمان کردەوە بە ماچوموچ. مانگەشەوێکی زۆر ڕووناک بوو. مانگی چاردە بە قەرا مەجوعمەیەک دەبوو.

لە چارداخەکەدا لە بەر دەرکەکە دانیشتبووین. درگای تێدا نەبوو، هەر چوارچێوەیەک بوو. ڕوومەتمان نابوو بە ڕوومەتی یەکترییەوە تماشای مانگمان دەکرد.

لەو خەوەدا ڕۆژان دەهاتن و دەڕۆیشتن، دەبوونە مانگ و وەرز. گەرما و سوورەتاوی هاوینم دی، پاییز و خەزان و با و گێژەڵووکە، زستان و بەفر و

سەرماوسۆڵ و کرێوە و بەهاری سەوز و گەش و ڕوخساری هەزاران گوڵ و مەلی ڕەزاسووکم دین. دەڵێم، ساڵێکم بە خەون دیت و کارەساتە پڕ لە دڵدارییەکانم هەموو لە بیرن. نامەوێ سەرت بێشێنم. »

بەو ڕستەیەی ئاخری، حاڵ و وەزعی چۆلەکەیەکی داماوی دەستی منداڵەورکەی هاروهاجم پەیدا کرد کە ساڵانی زوو غەرغەرەیەکی ساغیان بە خولخولەکەیەوە دێنا لاقێکی چۆلەکەی بەستەزمانیان بە سەرێکی دەزووەکەوە دەبست بۆیان شل دەکرد تا دەگەیشتە حەوێقی ئاسمانی. چۆلەکەی نەگبەت وەی دەزانی بۆ هەتا هەتایە ئازاد کراوە، بە کەیفخۆشییەوە باڵی لێکدەدان. بەڵام لەو سەرەوە دیسان دایاندەکێشاوە خواری و ئەمی بێتاوانی هیچ لە دەست نەهاتوو تا دەگەڕاوە ڕوخی زەوی هەر دەیقریشکاند. گوتم مامووستا تۆ دەردی ئەو چۆلەکەیەت بە من دا. مامووستا پێچوکلاوی فڕێ دابوو. بە پێچوکلاو و چاویلکەوە شتێکی دی بوو. زۆر وەک حەسەن زیرەک دەچوو. زۆر جاران ئەو هەستە ئەوەندەی قانەقدێ دەدام لەوانە بوو بڵێم دادەی مامووستا گیان گۆرانییەکم لۆ بڵێ!! بەڵام چی لێ بکەم، نێوی مەلای بە سەرەوە بوو، با ئەوەی برادەرم بوو پڕکێشیم نەدەکرد. بەبێ پێچوکلاو و چاویلکە، بە سەری سپیی تاشراوی (ئەڵبەتە تووکی سەری چڕ و پڕ بوو و نەوەریبوو) و بە نێوچاوانی بەرزیەوە، کە لە باری ڕوخسارناسییەوە تایبەت بە بنیادەمی خاوەن بەهرە و بلیمەتە، زۆرتر وەک ڕۆباتێکی زل کوێر دەچوو (وێنەکانی لاویم دیتوون دەمزانی بە جەوانی جوانچاک بووە)، بەڵام هەستێکی ئاگرین وەک ئاوی دەریای بێ سنوور لە تەواوی خانەکانی دەموچاویدا شەپۆلی دەدا. بە گاڵتەوە گوتم: «باشە، چۆنت دڵ هات لەو خەوەت خەبەر بێتەوە؟ من دڵنیام تۆ مەرتەبەت لە هی ئەسحابەکانی کاف بەرزترە. ئەو بەستەزمانانە سەتان ساڵ

نووستن خەونێکیان نەدی. تۆ بە شەوێک ساڵێکت بە خەون دی، ئەویش خەوی ئاوا بە پیت و بەرەکەت! بابم، خۆ لە بەهەشتێ ئاوات لەگەڵ ناکەن، وەکی بیستوومە حەفتا حۆریت دەدەنێ کە خێزانەکەی خۆت لە هەموویان جوانترە!»

من مامۆستاژنم بە قەرا دایکی خۆم جانم دەویست. شێرەژنێکی نەترسی لەخۆ بردووی تفت و تاڵیی ڕۆژگار چەشتووی وەک شیری هێندی، بە جەوهەر بوو. جەفای دونیایەی دەگەڵ مامۆستا کێشابوو. ئەو خاتوونە ئاکاری زۆر جوان بوو.

دیسان گوتم: «باشە، چۆنت دڵ هات خەبەرت بێتەوە! تۆ بەهەشتت بۆچییە؟ لەوێندەرێ حەفتا حۆری وەک مامۆستاژنت دەدەنێ!»

بە حاڵەتێکی وەک نیوەکوێران، بە هەڵەداوان دەستی بۆ ئیستیکانە چاییەکە و بۆ قەندانەکە برد. چایە ساردەی یەکبین هەڵقوڕاند. گوتم: «بۆ لێ نەگەڕای بۆت بگۆڕن، سارد ببۆوە. » گوتی: «گوێت لێنەبێ، ڕەمەزانی، من ساردی و گەرمیی ڕۆژگارم زۆر چەشتووە. لەو خەوەم خەبەر بۆوە. لە تاوی ئەو خەوە نەخۆش کەوتم، پازدە بیست شەوان بە جێوبان بۆی کەوتم. بەتەمام نەبوون. بەو سوورە هاوینەی چەقچۆیەکم دەهاتێ وەک برێشکەی نێو تاوە هەڵدەتۆقیم. چەلی وا بوو لە سەرمان وا دەلەرزیم بەو گەرمایەی دایاندەپۆشیم. جاری واش بوو گرم دەگرت، باوەشێکی باشیان لقوپۆپی بی بۆ دێنام، ڕووتیان دەکردمەوە نیوەی گەڵا بییەکانیان بۆ لە سەر جێوبانەکەم بۆ ڕادەخستم و نیوەشیان پێدا دەدام. ئافتاوە و لەگەنیان بۆ دێنام دەست و لاقیان دەشووشتم. بە گەڵای بی باوەشێنیان دەکردم. نەمردم و خەلەستم. بووژامەوە و بە خۆدا هاتمەوە.



سـالّیانی سـالّ بە سـەر ئەو قەزییەیـدا تێـپەڕی و مـن مەلا بـووم و مەلاژنیشم هێنابوو. بەلاّم هێشتا گەنج بووم و شاییبەخۆ. پێشـمەرگە بـووم و دەگەڵ هـاوالاّنی هاوسـەنگەرم بە پێـی دەسـتووریَ کە پێمـان درابـوو بەرەو گوندی ... کەوتینە ڕێ. من ئەو دێیەم قەت نەدیتبوو. بەلاّم هەرکە گەیشتینە قەراغ دێ، مچوڕک بە تەواوی گیانمدا هات: ئای ئای! کوڕە خۆ ئەوە هەر ئەو گوندەیە دەورانی فەقێیەتی بە خەو دیتبووم! بەینەڵلا، تەنیا گوڵدۆزییەکە دیـار نەبوو بەخێراتنمان بکا. کـووچە و کـۆلان و خـانوو و کـانی و سـەرانگوێلک و مـزگەوت و ڕێگاوبـان بـێ ئەملا و ئەولا هەر ئەو شـتە بـوو کە لە خەوەکەدا دیتبووم!

چووینە ماڵێک، هەمان ماڵ کە لە خەونەکەدا دیتبووم! کـوڕانی چەک لە شان لە هەمان هۆدەی تاییندا بە دەورە دانیشتبووین. بۆ لە جەنـگەی قسـە و باس و جەفەنـگ و پێکەنینـدا کـچە وەژوور نەکەوت! هەمـان ئەو کـچەی لە خەوەکەدا دیتبـووم. بەخێراتنـی هەمـووانی کـرد. ڕووی کـردە هـاوالێکی پێشمەرگەمان کە بە برینداری هێنابوویانە ئەم ماڵە و چـوار پێـنج مانـگ ئەو کچە تیماری کردبوو. کچە لێی چووە پێشێ، بە دەنگێکی دلێـری شـێرەژنانە، بە بزەیەکی تاڵی هەق بە دەستەوە دەستی ڕاستەی هێنا پێشێ سـەری سێ قامکی گەیاندەوە یەک و گوتی: «کاک... تۆ مـاوەی ئەو چـوار پێـنج مـانگەی وەک برای خۆم خزمەتم کردی، تەنانەت ڕووتم دەکردییەوە، لە سەر تەشتەکە دەمشتی، تۆ شەڕەفت، تاقە چرکەیەک تۆ هەستت کرد من دڵم بە تۆوە بێ؟! سەر دامەخە، سەر هەڵێنە چاو لە چاوم کە!» کوڕە ڕەنگی هێنا و بـرد، سـوور بۆوە، ئارەقی ڕەش و شینی دەردا، مرد، مردا هەر بە جاریَ مردا پێـی خـۆش بوو ببێتە دڵۆپێک ئـاو و بە عەرزیـدا بـڕواتە خـواریَ. کوڕەکـان بەزەییـان بەو

کوڕەدا هاتەوە، ویستیان باسەکە بگۆڕن، بە گاڵتەجاڕی بە دەوری کچەدا هاتن: «تۆ لەو قسانە گەڕێ گەڕ، پیاوا! مێردمان پێ بکە!» کچە ئەو بزەتاڵەی هەر لە سەر لێوی بوو گوتی: «وەڵڵا حازرم نیم تابووتەکەشم بە ئێنگۆ هەڵگرم! ئەوەی من دڵم دەیەوێ، ڕەنگە من بە پشیلەش دانەنێ. »

ئەو قسەیەی گوێقولاغ و بڕێکیش قوشقی کردم. پێچوکڵاوەکەی بۆ هاویشت گوتی: «باشە، مەیپێچەوە، لەو کۆڕە کێهامانت خۆش دەوێ ها ئەو پێچوکڵاوەی پێدا بدە!» کچە گوتی: «وەڵڵا ئەوەی من دڵم لە مێژە گیرۆدەیەتی ئەگەر گوڵیشم بە دەستەوە بێ دڵم نایە پێیدا بدەم!» گوتیان: «باشە، هەر نەبێ ئیشارەیەک بکە با ئەمەش بزانین. » کچە هات، هات، هات لە من نزیک بۆوە. ئەوا ئەو دڵم وا لە شەڕ لێی دەدا هەستم دەکرد خۆ هەڵداوێ خەریکە ئەوکم بگرێ، هەناسەم گیرابوو. پیشم دەرنەدەچوو. هات و غەززەبە ڕاست دەستی لە سەر شانی منی کۆڵەوار دانا! بە عەرزەکەوە وشک ببووم. ئەو بەژن و باڵا و ئەو ڕوخسارە کاڵ و کرچە ڕەزاسووکەی ئاورێکی وای تێبەرنەدام بە ئاوی هەرچی بەحری سەر زەوی وەکووژێ! گوتی: «مامووەستا ئەگەر بنێریتە سەرم، هەر ئەلحان مێردی پێ دەکەم. »

لێرەدا مامووەستا بێدەنگ بوو. خەیاڵ هەڵیگرت بردییەوە بۆ ڕۆژگاری لاوی، وا دیار بوو وەک فیلمی سینەمایی بە بەرچاوی کەمسۆمایدا دەهاتن و دەڕۆیشتن. ئەم ماوەیەکی باش واقی وڕ مابوو. دەتگوت پەیکەری ناکامیی ئەوینە. هەست و خوستی لە خۆ بڕیبوو. باسکی هێند شل و شەوێق داکەوتبوون سیغارەکەی لە دەست بەر ببۆوە نێو ژێر سیغارەکە و پێی نەحیسیابوو. تەپومژی ڕابوردوو وا زاڵ ببوو بە سەر ولاتدا، هەستم کرد من ئیدی دیار نیم، من نیم. نەمبزاوت، لێ گەڕام لەو حاڵەیدا وەمێنێ.

پیشێکی توندی خواردەوە، هەناسەیەکی دوور و درێژی هەڵڕشت: هەناسە نا، فرمێسکی وشک. وەئاگا هاتەوە، دەستی وەک قرژاڵێکی نیوە مردوو دەست لە خۆ داشتوو، وەجوولە کەوت و سیغارەی دەست دایەوە. پاش مژێک و دووان:

«ساڵێک لەو گوندەی مامەوە. بڕوام پێ بکە بەشی هەرە زۆری ئەو دیمەنانەی لە خەوەکەدا دیتبووم دیتمەوە. شەوێکیان، مانگەشەوێکی ڕووناک، لەو چارداخەیدا دانیشتبووین و ڕوومەتمان بە ڕوومەتی یەکەوە نابوو و چاومان لە ڕوخساری جوانی مانگ بڕیبوو. دەگریاین، بە کوڵ، پڕی بە دڵ. هەردووکمان دەترساین، ئەو دڵەمان هەمیشە لە یەک شت دادەترووسکا: منی ماڵوێران ژن و منداڵم بووا زمان و قەڵەم گۆ ناکەن و لە حاندی ئەو یەک ساڵە دڵدارییە سڕ و کپ و شڵەژاون. ڕەمەزانی، ئەوەی کە چ گوزەرا و چۆن هات و بۆ وای لێ هات و چم بە سەر هات نایەتە گۆ و نایەتە نووسین. »

بزەیەکی خەفەتاوی لێی بوو بە ڕووبەند تا چاوی بە فرمێسکی نەبینم. گوتی: «نازانم لە کوێوە شەماڵی شەیتانیی هەڵیکردبوویە و شتێکی بە گوێی مەلاژندا دابوو. ژنی تایینی تۆ بچۆ و بەرۆک بە پێشمەرگەکان بگرە و داوێنیان بادە و قورمیشیان بکەا کاکە گیان هاوالانم لێم بوون بە ڕەفێقی ناموافق و بە فرت و فێڵان بە دەورمدا هاتن و بە زمان گرتیانم و وایان هەڵداشتم لەو هەرد و مەکانەیان نەهێشتم. خوداگیرم بن، وەک پشیلەی زیانی خورۆ هێندەیان دوور فڕێ دام کە قەت نەگەڕێمەوە و چاوم نەکەوێتەوە بەو چاوە جوانانەا»

دوو قامکی دەستی ڕاستی جووت کردبوون و هەڵیهێنان و وەک نیشانەی سوێندێکی یەکجار گەورە ڕای‌دەوەشاندن:

«بە وەڵڵا ڕەمەزانی، ئێستاش کە ڕیشـم دەتاشـم و خـۆم تـاس و لـووس دەکەم و بەرگــی بۆشــناغ دەکەمە بەر، هەر بە یـادی ویــیە، شــێعری تەڕی دڵداریم بە مێشـکیدا دێـن، چ بێـنە سـەر سـینگی کـاغەز و چ لە سـینگمدا بمێننەوە، هەر بە یادی وییە. کسپەکسـپ و کاوەکـاوی ئەو بـرینەی بە هـیچ دەرمانێکی دانامرکێ، یارەبی زۆر شوکور، وا دیارە لە ڕۆژی بەرێ بەشی من وا درابوو.»

## سووکەئاوڕێک

کاوە عەزیزنژاد

ڕێـــــــگە هەورازە، ژیـــــــان بەرز و نەوی
پـــێ دەچـــی، خەم ڕۆ دەچـــی، تێــدەکەوی
لە هەڵـوۆی بەرزی چیـای قـافی ژیـان بـڕوانە
ڕۆ نەچـــــی، تەم دەرەوی، ســــەر دەکەوی

بە نێوی خوای گەورە و بێهاوتا

کـۆرپەی مێـژوو کـاتێ لە دایـک بـووە بە شـیری هەسـتی خەسـتی مێژوونووســان و پیاوماقوڵانی نیشــتمان مێـژۆک دراوە و فرچکـی گرتـووە، نووســراوەتەوە و خــراوەتە نـاو بێشــکەی ئەویــنەوە و نەرم نەرم خـزاوەتە نێـو مێشکی ئەویندارانەوە. بە گوڕوگاڵ و دارەدارە کەوتـووە، بە سـۆزە و لایەلایەی مرۆی بێگەرد و ناسک هەست و جوان پەرستەوە هەستاوەتە سـەر پەنـجە و وە لەنجە کەوتووە، بـۆتە ئـاوێنەی بـاڵانوێنی مرۆڤـایەتی و خـۆی نوانـدووە و ئاوێتەی ودم و کەلامی سیحراوی هەستی ناسکی ئاسکی غەزەل بووە، بە سەر بسکی شۆڕی پەخشانا شۆڕابەی بەستووە. بۆتە ئەوین یان باشـتر بڵـێم یـاری دێرین و یادگاری زێرین. ئەمجـارە سـرک و سـڵ دە بـاخەڵی بەیـت و بـاو و چیرۆکەکاندا گیرساوەتەوە و بـۆتە لاولاو. لە بەژنـی گـوڵە شـێعری شـەهید و جوانە مەرگان هاڵاوە، چەشنی ئاوی زوڵاڵی چاوی کاڵی کانیاو ئۆباڵی گـۆزەی وە ئەستۆ گرتووە و بە سەر سینگ و سوخمە و گۆبەرۆکـا چـۆڕاوەتەوە، بـۆتە گۆرانی و ئاهەنگی شوان و هەنگی خەیاڵی بەدەنگ هێناوە. ژوانی ڕاستەقینەی

سەوەزانی هەڵوەدایی بۆ گێڕاوەتەوە، ڕۆندکی ئاڵی بۆ چاوی کاڵی زێد و لاپاڵی وەتەن هەڵڕشتووە و بنەمای ژیانی بەژانی بە گوڵەبێژانی چیای عیشق و پڕ لە گڕی کوێستانی نیشتمان دامەزراندووە.

لە دڵەوە دەڵێم مامۆستا ڕاوچی، یەکێ لەم مرۆڤە نیشتماندۆستانە بوو، سەرکەوتنی خۆی و بنەماڵەکەی لە پێناو خزمەت بە گەلەکەیا دۆزیبۆوە. ویستوویەتی لە چوارچێوەیەکی خاوێنی خۆناسی و خواناسی و ماندوونەناسی و نیشتمانخۆشەویستیدا خزمەت بە مرۆ بکات. ئەو «ڕاوچی» بە مەچەک و دەس و مەکوچ ڕەنگینەی لە جێ خۆی و بە ڕێ خۆی لە سەر ماف و مەرامی هاتۆتە وەلام و گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگای بە زمانی ڕەسەن و فۆلکلۆریک هێناوەتە سەر ڕوومەتی سووری دەفتەری خوێنینی ژیانی نەتەوە هەژار و دڵبریندارەکەی. جا هەر زەمانێ بە زمانی تایبەتی خۆی (شێعر، چیرۆک و پەخشان یانە قسەی خۆش و نامیلکە و... ) هەر وەک چیرۆکی بووکی گۆڕستانی کۆن پەخشانی پۆڕ و هەڵۆ، خولە و پیزە یان ئەوەی ڕووداوی نەبیسراوی «سوارە و سوورە»ی لە زمانی کابرایەکی نەخوێندەوار بەلام بەئەزموون و لەمێژینەی لادییی وەک «مامە قالەی گوندی یاغیانی» ناوچەی موکریاندا بیستووە و بۆی بۆتە چیرۆک و مەکۆی سەرنج و ڕاپەڕین و دونیای بێدەنگی پێ تێک شکاندووە و مەبەستی ئەو زەمانێ بە زمانی زگماکی دەربڕیوە. ئەو مامۆستایەی پەڕاوی ژیانی لە ناو گێژاوی هەڵوەدایی و زیندانا گێژی خواردووە (ساڵی ٣٨ تا ٤١ لە زیندانی قزلقەلعە و قەسری قاجار لە تاران) بەند کراوە و تەنانەت یەک لە سەدی ئاواتەکانی نەهاتۆتە دی و سەربەمۆر ماونەتەوە و هەر وەک خۆی ماوەیەک بەر لەکۆچیدا دەڵێ: «ئەوەی

دەمهەویست ببینم تێر بە چاوانم نەمدی[1]» تۆ بڵێی چەنی بیرۆکەی فەلسەفی لە نێو ئەم چاوەبڕکێنەی شاعیرانەدا شاردرابێتەوە؟ ڕاوچی ڕۆیی بەڵام بەداخەوە ئێستاش هێندێ وشکەسۆفی و ڕژد و چاوچنۆک هەن چاوی دیتن و گوێی بیستنی بیر و بڕوای ئەم بەرزەفڕەیان نییە. ئەمنیش بەڵێنیو پێدەدەم دەنک بەدەنک گەوهەری هەستی دێتەوە نێو بیر و مەبەستان. پیرەمێرد وتەنی: «نامرن ئەوانەی وا لە دڵی میللەتا ئەژین.»

لە بیرمان نەچێ سەبارەت بە «بووکی گۆڕستانی کۆن»، ئەم بووکە ڕەزاسووکە هەر بە کیژۆڵەیی هەرزان فرۆش کرا چاپەمەنی سەیدیانی مەهاباد لە دەس ڕاوچی دەرهێنا و زیندە بە گۆڕی کرد. قەرار بوو لە چاپ بدرێ. دوای چەن ساڵێ چاوەڕوانی ئەم بووکە ئێسک سووکە سەر لەنوێ شایی ژیانی لێ بوو بە شین، لەبری چاپ کۆپی کرا و بە هەناسەساردی سەری نایەوە. بە خۆشییەوە گۆڤاری «سروە» ئەم کەم و کوڕیەی تێ هەڵێناوە و بە چرووپڕی بڵاوی کردەوە. ئەو پەریزادەیەش بە مرادی خۆی گەیشت و لە کۆشکی ئەدەبدا ئارامی گرت.

پێم خۆشە زۆر بە پێ پیلان و ڕاوێژکاری و بە وردی بڕۆمە پێش وەک ڕاوچی تۆڕ ورد، وردیلەکانیش وەدوا نەدەم. تەنانەت فلاش‌بەک بۆ دواوە و گەڕانەوەش. وەک دۆزینەوەی شێعر و دەس‌نووسی باپیرم (مامۆستا سەییادی) ـ وەکی لە دیوانەکەی ڕاوچیدا هێناومن لە داهاتوودا کاری لێکۆڵینەوەیان لە سەر دەکەم ـ ژانی ون‌بوونی بیرەوەرییەکی ڕاوچی دەیهەژاندم. ئەویش

---

[1] حەوتەنامەی داهاتوو، پاییزی ساڵی ٨١ی هەتاوی ـ دیمانەیەک لەگەڵ ڕاوچی؛ وتووێژکار: ئەمین گەردیگلانی.



بەڕێزان فەتاح ئەمیری و محەمەد ڕەمەزانی بێدڵییان نەکردم و بە وردی نووسییانەوە.

دیسان سوپاس بۆ تەواوی ئەو کەسانەی لە ڕێبازی کۆ کردنەوەی شێعر و چیرۆک و قسە و بیرەوەری «ڕاوچی»دا یاریدەیان دام، هەر وەک لە کۆنەوە وتوویانە: «دەستێ بەتەنیا تەقەی نایە».

# بووکی گۆڕستانی کۆن

گوندێکی ڕەزا سووک و ڕازاوە. لە ناو هەموو گیان و دڵێکا جێ‌گیر. نازاوای ناو باوەشی کێوەکانی قەندیل، ناوداری هەرێمی ئاکۆیان لە سێبەری داری بەریدا تۆخ و لە تین و هەتاوی هاوین بێ منەت. لە بۆن و بەرامی خۆشدا خەنی، لە بیزا و بەڕەزا و چنوور و چەورینا خاوەن بەش. بە هەڵز و کەما و مەندۆک ڕووگەش. کێوەکانی سەر لە ئەستێرەن و ئەستۆیان تەماشاگەی شاو شالیارن. شاخەکانی قوت و قۆز و گوێچک سووکن. چی بۆ دەڵێی دەیڵێتەوە، ڕەوەز و ڕازی بە نێو چیرو جێگە ڕاوی سەدان قۆڵە میر و هەزاران سیامەند و خەجی مل بە کوێنن. قەڵای مێران و ڕوانگەی دلێران و پاردەی دێوان و بازی کێوان، هەوارگەی بژوێنی ئەو گوندە ڕازاوەن. بژێوی گیانی لەو شوێنە حەیران و بەیت و باوی کۆن و کورتە چیرۆکی ڕەندە پیاوانی ڕابوردوون.

پێخۆری پێ‌ژیان، بزە و نیوە نازی نازفرۆش و شایی بە خۆیانن. یاسا عەشیرەتی و شێوە ژین مەڕداری چەقەساوی ژیان هەوارە و هەوارن. کورتەک و جامەدانە و چەکمە و وێزەنگی کوردی کەحێل و مەحەندەکی خۆش هەڵبەز و خەنجەری دەبان و کێردی وەستا نەبی و کڵێتەی وێنە کۆیی، بەڵگەی شانازی سوارچاک و شایی بە خۆیانن. دەمی عیسا و عەسای جادوو بەزێنی مووسا و ودمی لوقمانی حەکیم لەو شوێنە خاوێنە شەوبای بەرەبەیانی ڕووناک و هێمنی هێنە. شەوبای شەوی ئەو شوێنە بێ وێنەیە. نە پێنووس

ئەتوانێ لە تاریفی پێهەڵگرێ و نە بەستەبێژ توانای پێ هەڵگوتنی بۆ دەس ئەدات. مەگەر بڵێم شەوبا لەوێ شاباڵی بەختەوەری سێبەری بەزەی خوای کێوپاران و هەناسەی ژیانی بێ زیوانە. هەموو شەوێ هەموو ڕەزان دەنگێوێ. ڕەوەزان دەگەڕێ و لەپاڵ و پەسیوان تێدەپەڕێ. گیان وەبەر پەراوێزاندا دەکا. لە کووچەی بیزا و بەرەزایان دەڕوانێ و سەردەمی کۆرپە گوڵان دەکاتەوە، نساران دەپشکنێ و پرچ و پەرچەمی چنوور و چەورینان بە شانە دەکا و عەتریان لێ وەردەگرێت و کاکۆڵی ئاڵەکۆک و شیرین شۆکان هەڵدەداتەوە و تینی هەتاویان تێ دەرژێنێ و ژینیان پێ شیرینتر دەکات. لە هەموو تەلان و تەرتان بەرۆکی گوڵە باتوون و یەخەی بەند و خاوان دەترازێنێ. کۆرپەی بەیبوون و هەڵاڵان دێنێتە پێکەنین. لە هەردان دەردان ڕەپێ دەنێ. نەخۆشان دەلاوێنێتەوە. لە دەشتۆکە و گوێ چۆمان لەگەڵ هێرۆیان ئەدوێ و خارا و دارایان لە بەر دەکا. عەتر و گوڵاو لە جاتر و بێژان وەردەگرێ و لە سەر گۆڕی شەهید و جوانەمەرگان ئەسرین ئەبارێنێ و لە هەموو ڕەشماڵ و کەپرۆکەی بە ڕیحان و هۆزەڵاو تەنراو میوان ئەبێ. ئامێز لە جوانان وەردێنێ و نەخۆشان دەبووژێنێتەوە و ماندووان ئەحەسێنێتەوە و مێشک و زار و دەمان بۆن خۆش ئەکات.

مۆجزاتی نەخۆشی دەمرێنێ. نەتەوی دامان و لاوازی وەدەردەنێ، هەتیو و هەژار و سامانداران بە چاوێک چاولێدەکا و بە زمانێکیان ئەدوێنێ. هەموو هەوایەکی خۆش. لە خۆشی هەوای ئەو شۆبایە بایەخی پێ دەدرێ. بەهەشتی ناودار و نادیار شەوگوردی لە وێنەی جوانی ئەو هەرێمە هەڵگیراوە. هەرێمی





ئاکۆیان بە تایبەتی گوندی ئەستێرۆک، دەبێ بڵێی بەهەشت و قەسر و حۆری. قارەمانی چیرۆکی (بووکی گۆڕستان) واتە مەم و زین، دوو ئەوینداری دڵ بریندار، کەژاڵ و شۆڕش، دوو قوربانی دەستی ئەنقەست و دوو پەپوولەی باڵ زێڕین، کچی حەمە سوور و تاقانە کوڕی بنەماڵەی کوێخا سولەیمان، دانیشتووی ئەستێرۆک، لەدایکبووی شەوێک و نیوەکەبڕەی دەستی مامانێک بوون. هەر لە سەر بێشکەوە لە دەمی شیرەخۆریەوە ناوی یەکتریان لێهات و بە ویستی «باوک و دایکی کەژاڵ بوو بە مارەبڕەی شۆڕش. » دوو ساوا، دوو شیرەخۆرە خڕەکەبوون و خرانە قوتابخانە و ناوەندییان تەواو کرد و خۆشەویستیان پتەوتر کرا و هەمیشە چاویان لە باڵای یەکتر نەدەترووکاند.

حەوتەیەک حاوانەوەیان بەبێ یەکتر حەستەم بوو. بڕیار درا پاییزی داهاتوو کەژاڵ بە بووکی بۆ ماڵی کوێخا سولەیمان بڕوات و ئاوات و نیازی شۆڕش وەدی بێت. بەڵام دەست و مستی نەزان و باوکی دڵڕەق شووشەی هیوای ئەو جووتە ئەویندارەی وەها لە بەردی بێنازیدان کە ئەو شایی و زەماوەندە، ئەو پێکبڕانە کەوتە جیهانێکیتر و هەستانێکیتر و ڕاسانێکیتر.

## بووکی گۆڕستانی کۆن

کەژاڵ کیژێکی خوێندەوار و سەر و قژ کاڵ و دیمەن ڕێک و شەرمن و هێواش دوێیە. کۆشکی بەختەوەری خۆی بە چرای خۆشەویستی شۆڕش ڕازاوە دێتە بەرچاو. بۆ سەرکەوتن و چوونە سەر ترۆپکی پێکبڕان ماوە لە سێ مانگ زیاتر نەماوە. ئەگەر دەستی ئەنقەست و زمانی شەیتان و شۆفاران

لێگەڕێ ئەو بەشی خەو و خەونێکی خۆشە. کەژاڵ لە زمانی سرتەی دەروون و چرپەی خەیاڵی تاڵی خۆی لەگەڵ خۆی ئەدوێ و زۆر بە سەرسامیەوە ڕوو بە خۆی لە دەردی دەروون و تاریکی هیـوای دەکـۆڵێتەوە و دەڵـێ: تێنـاگەم یانی چی؟ دەبێ چم بێ، چیم بە سەر دێ، چیم بۆ گوترابێ، چ زار و زمانێکم بۆ کرابێتەوە؟

خورپە، هەناوەکوتە، ڕاچڵەکین، ترسـان، بـێ هیـوایی، دوو دڵـی، گومـان، قورقەپی، یانی چی؟ ئەویش بۆ من! یاخوا خێر بێت. مـاوەیەک خەم و پەژارە لە زار و ژەنگی ناوم و بێ ناوی هورووژمی کردوومە سـەرێ و بـێ سـەرەدەری هەمـوو دەرگـای لـێ پێـوەداوم. بەڕاسـتی هێزێکـی دزێـو و نەبینـراو هێـزی خستوومە سەر و سەری لێشـێواندووم، بـێ خەوی شـەوان و فرمێسـکی ڕژاو ئێسقانی باریک و باڵای لاواز کردووم. تەمێکی ڕەش تاوڵی لە سەر هەڵـداوم و خەیاڵی تاڵیش فاڵی خراپم بۆ ئەگرێتەوە، نوشتە و دوعاش چارەی گەیاندوومە پشتی شێران و سەرووی ئەستێران.

زۆر دەترسم ئەو ترس و ڕاچڵەکینە پێش قەڕاوڵی ڕووداوێکی ڕۆشن بێـت. ئەترسم زەماوەندی خـۆم و شـۆڕش نەبیـنم. بە دەسـتی پیسـی خوانەناسـان تەڵەیەکم بۆ نرابێتەوە و سەرە ڕێگای هیوام تەنرابێت. خوایَ گەورە هەرچەنـد ئەکەم و ئەکۆشم نە دەسـتم لە قەدی خەمـم ئەکـاتەوە و نە گـرێ کـوێرەی گرووی هەناوم بۆ دەکرێتەوە، ئەترسم سەرەتای شـێتی و فیداری دەمـی بـۆنی کردبێتەوە و دەستی ملۆزمانم لێ وەشابێت و بە چەشنی «هێرۆ»ی با بە جێی خەیاڵ خۆم بکەمە قوربانی ڕووبار. باش تێئەگەم کە من کەژاڵی جـاران نـیم،



به ئاوێنه وێنەی خۆم ناناسمەوە، ڕەق و تەق و لاواز و بابردەڵە بووم، هەموو شتێکم لەبیر کردووە، تەنانەت قاقا و بزۆزی کچانەشم لە دەس داوە، بزە و نەشە و گەشەشم بە هەناسە و هەنیسک گۆڕیوەتەوە و نازانم بەرەو کامە حەکیم و کام نوشتە نووس و تێهەڵڕوانان وەرێ کەوم، نەخۆشی نەبینراو و نەناسراوی کچانەم نیشان بدەم و ئاگری گڕ و دووکەڵی هەناوی داپلۆخاوم بە کامە دەرمان و چارە وەکوژێنم.

بەڕاستی سەر لێشێواوی بنەوانێکی قووڵ و بێ سەروبنە، قارەمانی دەوێ کە تێیدا نوقم نەبێ و سەر و پێی خۆی لێ گوم نەبێ. درۆ ناکەم. ڕۆژێک بە تاریفی پوورزا ناسکێ‌وە زۆر پەنامەکی پەنام بۆ نووشتە نووسێک برد. نوشتەنووس سەیدێکی بەرگ و سیپاڵ جوان و دیمەن ڕێک و عەبا شۆڕ و شاڵ بە سەر بوو. سڵاوم کرد و بە شەرمی کچانەوە بە هەزار دڵەکوتە و زمانی بۆڵەوە، ویستی خۆم یانی نەخۆشی گیان و سام و ترسی شەوانەم ڕاگەیاند.

نووشتەنووس چاوێکی زەقی لێکردم و برێک لێوی جووڵاندەوە و کتێبی پان کردەوە و دەستی لە سەر دڵم دانا و برێکی لێو جووڵاندەوە و هەناسەیەکی سڕی هەڵکێشا و گوتی ڕووبەڕووم دانیشە.

ڕووبەڕووی چاوی زەقی پڕ لە خەیانەت و شاڵاوی ئەو نوشتە نووسە دانیشتم. هەموو گیانم بە ئارەقەی شەرمی کچانەوە شەڵاڵ بوو. واقم ورما و دەمم بوو بە تەڵەی تەقیو.

پاشی ماوەیەک گوتی: کیژی جوان ئەتۆ ناحەزان نووشتەیان لێکردووی و لە قاپی پۆڵایان قایم کردووە و نەحلەتیان لە تۆ هارووژاندووە و دەستیان لێ

وشاندووی. چاک بوو هاتی، ئەگەر فریای من نەکەوتبایەی پاش چل ڕۆژی‌تر فێ و لەخۆچوون، سەر و دڵی دەگرتی، ئەو جار چارەت بە لوقمان و نووشتەنووسان نەدەکرا، کیژم دوعای «ئەبوودووجانە»ت بە دڵ و بە گیان بۆ دەنووسم، گیانی نەحلەتیانی پێ دەسووتێنم و جادوویان پێ بەتاڵ دەکەمەوە، ئەبێ نوشتەی ئەبوودووجانە بەیانی لە پێش گزینگی هەتاو بنووسرێت، لەگەڵ گەڵای زەعفەران و سمێڵی ماسی سپی و نانۆخی شەمشەمە کوێرە و تویکڵی هێلکەی مریشکی ڕەش لە حەوت بەرگی ڕەنگاوڕەنگ گیرێ و لە گۆڕستانی کۆن لە ژێر کێلی نابالغێکەوە گۆڕ بکرێت بە قامکی شادە و ئاوی مێخەک ناوی چل سوارەی غەیبی لە ژێر گۆ مەمکی چەپت بنووسرێ، سەرقەڵەمانەکەشی بیست دینارە، ئەگەر خاترت بگرم. پشت بە جەددی گەورە دێیەوە سەر حاڵ، نەخۆشی وام زۆر چار کردوونەوە، دەبڕۆ بەیانی زووتر، پێهەڵێنە، خۆت تووشی شێتی مەکە.

ئیتر لە وتەی نووشتەنووس و ناوی نەحلەتی و سمێڵی ماسی و نانۆخی شەمشەمە کوێرە و کێڵی نابالق و گۆڕستانی کۆن وا داخورپام کە بۆ خۆشم نەمزانی چیم لێ‌بەسەرهات و چۆن بە عەرزەوە بەند بووم. دڵم چۆن دەستی بە هەڵە و پەلە کرد، دەمم وشک بوو و تەزووی سڕ سرتەیَ لێ بریم و سامی لە سەر پەڕاندم و لە ژێر ئاگری شەرم و ئارەقەدا تولاتولا بووم و بە تەواوی بوومە شێتێکی ڕاستەقینە.

هەر جۆر بوو شرەی خۆم لە قوڕ ڕاکێشا و پێنج دینارم داچاند و بەرەو ماڵ گەڕامەوە و نووشتەنووسم بە جێ هێشت.

هەرچەند نووشتە نووسم جێ هێشت، هەرچەند لام وابوو پیاوێکی لاسار و فێڵەباز بوو، لە متمانە دوور و لە شەرەف بێبەش بوو، سەرەڕای ئەوەش وتەکانی لە سەر گیانی من بوونە نەخۆشی خۆرە و شەو و ڕۆژ زیاتریان جێگە دەکردەوە و پتریان ئازار دەدام، بە تایبەتی ناوی مۆتە و ملۆزم و نەحلەتی ئاڵە و خێوی سەر ئاوان، لە ناو بیر و مێشک و خەیاڵا وایان خۆ مەڵاس کردبوو بە سەدان ناوی خوا و پێغەمبەر و پیاوچاکان بۆم نەدەڕەوین و بەرچاویان چۆڵ نەدەکردم. لە نەخۆشی خۆم زیاتر کەوتمە گومان و دوودڵییەوە، دەمەویست نووشتە بنووسم بەڵام لە خەیانەتی فاڵگر و حەیای کچانەم دەترسام و لە زار و دەمی شەیتان و شۆفاران زیاتر دەسڵەمیمەوە.

سەد بریا نەچووبام و نەبووبام و ئاوا تووشی ترس و سامی مۆتە و ملۆزم و مۆجزاتان نەکرابام. ئێستا بە وتەی نووشتەنووس کەژاڵێک شێت و پێت و فێدار و داهاتوو وێران، بانگ دەکرێم کەژاڵە شێت.

ئەگەر بە نووشتە و جادوو نووسین خۆم ڕازی بکەم ئەو هەموو کەرەسە و کەل و پەلەی پێویست و دیناری سوور و شین، لەکام شوێن وەدەست بێنم. بەچی ڕۆشنە کە نووشتەنووس دەسەڵاتی تێکشکانی دەستی مۆتە و ملۆزمانی هەبێ؟ بەچی مەعلوومە ئەمن نەخۆشی ڕووحی و دەس لێوەشاوی نەحلەتیان بم؟

ئیتر من هەر بە خەون و خەیاڵی ئاڵۆز، یان بە دوو درۆی جادووبازێک خۆم تووشی سەدان بەیت و باوی زار و زمانی خراپ دەکەم. بانگ ئەکرێم کەژاڵە شێت. نەخێر، لە چوونم، لە نووشتەنووسینم لە نیشان دانی نەخۆشیم

پەشیمانم. لەوەشی ترسم هەیە کە نووشتە نووس سەرم لە سەر هەڵنەگرێ، کارەسات بدرکێنێ، لای ئەم و ئەو، دۆست و بێگانە بیکا بە قاو، خەڵک تێبگا، «شۆڕش» پێبزانێ، ئەی خوای گەورە ئەبێ بڵێم خەمم بەبار و ئەو کارەشم سەربار.

بەڕاستی نابێ خۆم فریو دەم. نەخۆشم، کەژاڵ نەماوم، دەبێ ڕێ چارەیەک بۆ خۆم ڕەچاو کەم. دوێنێ نەسرینی دەستە خوشکم، هاوکلاسم، هاوسێم، درا بە شوو. دەنگی دەهۆڵ و زیڕەی زورنا هاواری شاباش و پێ هەڵگوتن، گەڕی دیلان و ڕەشبەڵەک، سەماو زەوی هێنابووە سەما، کچانی ئاوایی کەس نەمابوو کە نەچێ و وەسەما نەکەوێ. کەچی من چاوێکم لێ هەڵنەهێنا. هەروەک نە گوێم کون بێ و نە دڵم تەڕایی تێدا بێ. تەنانەت بۆ خواحافیزی نەسرینیش دەرگام نەقەڵاشتەوە. کەوایە بۆ دەبێ بڵێم شێت نیم، ئەی شێتی چۆنە؟

دەوری پازدە شەوێکە، زیاتر لەو ماوە نییە کە هەموو شت بۆ من بۆتە گرێ کوێرە، هەموو شت ڕوو بە گۆڕان دەڕوات. سەرم لێ بۆتە گورز، بەر پێی خۆم بەدی ناکەم. تا ئێستا هەڵنەکەوتووە لە حەوتەدا لەگەڵ شۆڕش، بەیەک نەگەین و ئاڵ و گۆڕی خۆشەویستی تازە نەکەینەوە.

ئەوا دوو حەوتەیە لە یەک بێ خەبەر و تەنانەت دایکیَ شۆڕشیش ڕووی خۆشی لێ نەکردووم. دوێنێ دایکی شۆڕشم دی ویستم برێک مەبەست بدرکێنم بەڵام ئەوندە وشک و برینگ و بێ نەشە بوو کە ماوەی پرسیاری پێنەدام، دڵی پڕبوو لە گلە و بناشت، ڕووتاڵ و توورە و لە سەر شەڕ بوو. زۆرم دەوردا، داوێنم گرت، پاڕامەوە بەڵام هیچی نەدرکاند و لە مەبەستی

تێنەگەیانـدم. میـوانی هەبـوو، ڕۆیشـت. ڕۆیشـت و ئەوندەی‌تریشـی خەفەت خەڵات کردم. نازانم بۆچی نەیەویست سەراپا کارەساتم تێگەیەنـێ و هەرچـی هەبێ و نەبێ بیدرکێنێ. ئەوەی کە بۆم ڕوون بوو ئەوە بوو کە کوڵ و دڵپـڕی دایکی شـۆڕش پێوەنـدی بە مـن و شۆڕشـی کـوڕیەوە هەبـوو. زۆر وێـدەچێ نوشتەنووسی خوانەناس کارەسـاتی نەخۆشـی منـی ڕاگەیانـدبێ و پەردەی لە سـەر کارەسـات هەڵـدابێتەوە، دوور نیـیە هەر ئەو دەنگـۆیەش ببێـتە هـۆی جیابوونەوەی من و شۆڕش و تووڕەیی دایکی شۆڕش.

کەژاڵ ئەستێرەی هیوای بەرەو ئاوابوون و پاشەکشەیە. هەر ڕۆژێ کۆسـپ و کولۆیەک کۆڵەی دەکوتێ، چرای ژیانی لە کوژانەوە دایە، بەخەیـاڵ و بیـری تاریکەوە سەری لێشـێواوە، بە خەو و خەونـووچکەی نـاحەزەوە هێـزی لە بەر براوە، ترسی هەرە بە سامی لە نەخۆشی شێتی و جیابوونەوە لە شۆڕشە. شـەو لە خەویدا شێر دەیڕفێنێ و شۆڕش دەیگـرێتەوە و دووبـارە سـێڵاو ڕایـدەدا و شـۆڕش دەیگـرێتەوە. کەژاڵ بەو سـامەوە لە خەو ڕادەپەڕێـت، لە مانـای خەوەکەی ورد دەبێتەوە و بە باشی دادەنێ! لای وایە بەڵایەکی بە سـەردێ و بەڵام سەری لە سەر هەڵدەگرێ و ئاخری بە خێر دەگەڕێت.

**دووبارە هاتنی دایکی شۆڕش بۆلای کەژاڵ:**

کەژاڵ: بـاجی فـاتم! بەڕاسـتی تاسـەم کردبـووی. لێبڕابـووم ئەورۆکە بـێم بۆلاتان، شانسم هێنا و تۆ هاتی. بەڕاستی ئەوشۆکە نەسرەوتم، وتەکـانی ڕۆژی بەرووت و مۆنی و ڕوو ناخۆشیت هەموو گیانی لە پەژارە پێواوم. لە قسـەکانت

نەگەیشتم، گیر و گرفت و ڕووداوت بۆ شی نەکردوومەوە، هەناسەی پڕ پریشک و دڵۆپی فرمێسکی چاوت چاوەی ژیانی لێل کردووم، ئۆقرەی لێ‌هەڵگرتووم، وەکوو شێت و فێدارم لێهاتووە و ورێنە ئەکەم، تلاسکە ئەبەم، لێر و لەوێ دەڕوانم، مەترسی بەڵا و باڵ شکان ڕووی تێکردووم. دەستم بە داوێنت هەچی هەیە و نییە بیدرکێنە. کێ دڵی شکاندووی، کێ چی بە گوێدا چپاندووی، لە منی مەشێرەوە، پێم بڵێ با منیش لە دڵەکوتە و هەزارەی خەیاڵ خەلاسیم بێت.

باجی فاتم لەگەڵ هەناسەیەکی ئاگراوی، پۆلێک فرمێسکی لاواز، لە وڵامدا کوتی: کەژاڵ گیان تازە هیچ، هەرچی بوو تێپەڕی، هەر بەو زووانە، هەر ئەو جومعەیە هەموو ڕووداو و شانۆی پیلان گێڕی دەرەبەگەکان دێتە ڕوو، تێدەگەی کە هیوا، تەما، خۆشەویستی و ئاوات هەمووی بن ئاو دەبێ و خەرمانی ئەوین و هێلانەی ژین بە دەستی ئەنقەست بە خەیانەتی باوکت ئاگر دەدرێ و گوندی ئەستێرۆک، گوندی خۆشەویستی دەبێتە چاڵی دژایەتی و دووبەرەکی بۆ هەمیشە. بۆ هەتا هەتایە. باوکت تەفرەی داین، لە چاڵی ناین، چاوی بەستین، ئابڕووی ڕشتین، بووکی ئێمەی فرۆشت، لێرە بەملاوە ئێمە بووک و خەسوو نین، دۆست نین، هاوسێ نین، بەڵکوو دوو دژ دوو دەم بە خوێن.

کەژاڵ: ئەی خاک بەسەرم چی ئەبیسم، چی ئەڵێی من لە هەموو ئەوانە بێ هەواڵم، باوک بە من چی؟ چی کردووە؟ بۆ ڕاستییەکەی هەڵناڕێژی؟ بۆ لە ژێر پەردەوە پەڕ و باڵی بۆ ئەسازێنی؟ بۆ بە ئاگری باوکەوە ئەمسووتێنی؟ بۆ

ئەمخەیتە تای تەرازووی تاوانی باوکم؟ بۆخاتری خودا تا گیانم دەرنەچووە، تا لە خۆم نەچووم، زووتر بڵێ چ قەوماوە؟! من هەر کەژاڵم، کەژاڵ هەر شۆڕشی لە خەیاڵە و هەر بە داوی خوشەویستی ئەو پێچراوم. ناگۆڕێم، نادۆڕێم، لە سەر مەرجی خۆشەویستیم سوورم، پتەوم ڕاوەستاوم، هیچ تین و تەوژمی نالەباری مێژوو ناتوانێ باری ویستم بلەرزێنێ. زووتر بڵێ بزانم ڕووداو چییە و چیان بۆ تۆ گێڕاوەتەوە؟

باجی فاتم ڕوو بە کەژاڵ ئەڵێت:

کەژاڵ گیان ئەزانم تۆ پاکی، ڕووسووری بە غیرەتی، بێ زمانی، لە شیر پاکتر و لە تاوان دووری، بەلام باوکت کتکە نەوتینەیە، هەر بە سووتانی خۆی ڕازی نییە. بەڵکوو کۆمەڵێک خەڵک، کۆمەڵێک لاو کۆمەڵێک هاوسێ بە خۆیەوە ئەسووتێنێ. کەژاڵ گیان بڕیار بوو پاشی سێ مانگی‌تر کە خێڵ کوێستانی چۆڵ کرد زۆربەی پیاوماقووڵ و لاوی قۆزی مەڵبەند لە شایی تۆ و شۆڕشی‌دا دەستی دیلان لە دەستی یەکتری گرێ بدەن، حەوت شەو و حەوت ڕۆژان بۆ تەقڵە و جلیت و خۆ پیشاندان تەرخان بکرێت. بەلام ئێستا ڕووداو بە ڕوویەکی‌ترەوە ڕووبەڕوومان ڕووی لێ هەڵمالیوە، بێ سەرپۆش ئەبێ بڵێم ئێستا تۆ مارە کراوی قالە زلەیت، قالە زلەی کۆنە میراوی سوڵتان ئاغا. سوڵتان ئاغای کەڵەکباز، بە داوی قالەزلە تۆی ڕاو کرد هەر وەکوو کچی ئەمەر خانی لە خەیانەت‌دا سووتاند و بۆ هەمیشە بێ ناوی کرد. تۆی داوە بە قالەزلە و خونچەی خوشکی قالەزلەی داوە بە باوکت، ئێستە تۆ دوو دایکت هەیە و کچی دوو دایک کەیبانووی قالەزلە و مەشکەژێنی ماڵی سوڵتان ئاغا.

دوور نییە هەر ئەو حەوتەیە لە دیلانی خونچە بێوەژەن و خەنەبەندانی خۆتـا وە سەما کەویت و ئێمەش دەستی سەرچۆپی بگرین، بەڵام سەرچۆپی دیلانی پیلان. سەمای خـوێن، خەنەبەنـدانی خەنـجەر، زەماوەنـدی سـوور، جلیتـانی مەرگ، مردن، دووبەرەکی و دژایەتی ...

شۆڕش تاقانە ئەستێرەی حاسمانی من و هیوای تۆ حەوتـوویەکە بـۆ مـاڵە خاڵوانی بەرەو گەرمێن ڕۆیشتووە. بە بیستنی بەشوودانی تـۆ ئەڵـێن نەخۆشـە، تەختی جێگە و بانە، باوکی زۆر بەپەلە بەرەو ئەو شوێنە وەڕێ کەوتووە. بەڵام ئەوەش بزانە لە باوکت زۆر تووڕەیە، دڵی پڕ لە کەف و هێـرش و هەڕەشـەیە، بەڕاستی لە شالاوی تووڕەیی کوێخا سولەیمان زەندەقم چووە، دوور نیـیە لەم ڕۆژانەدا پەلامـاری خـۆی ڕاسـتەوخۆ نیشـان بـدات و لە نێـو دوو هـۆز، دوو بنەماڵە، دوو هاوسێ خوێن بڕژێـت، ئابڕوومـان بـڕوات، خۆشـی بەربـا بێـت و دووکەڵ و چرەچەمانێ دژایەتی گوندی ئەسـتێرۆک لە نـاوچەی ئاکۆیـان بـۆ هەمیشە بۆ هەتاهەتایە بۆچەکەی نەبڕێت و بە هیچ با و بارانێک لە کـووژانەوە نەیەت. ئیتر بۆ نەگریم، بۆ نەبارێنم بۆ خۆم، بۆ تۆ، بۆ شـۆڕش، بـۆ بنەمـاڵەی هەڵۆەشاو، بۆ خۆشی بەبادا چوو و ئاواتی پێنەگرتووم. بۆ دەردی بێ دەرمـان و نەخۆشی بێ لوقمان ...

کەژاڵ: «نا، نـا بـاجی فـاتم شـۆخی مەکە. قسـەم لـێ دامەکێشـە. تـاقیم مەکەوە، ترسـم وەبەر مەنـێ، لەگەڵـم وا مەدوێ، دڵـم دامەخـورپێنە ئەوندەی‌تریش هێـزم لە بەر مەبـڕە، مـاوەیەکە تـرس و سـام و بـێ هیـوایی

هاڕیومی، کوشتوومی و سەری لێشێواندووم. خەو و خۆراکی لێ ئەستاندووم و وشک و برینگی هەڵێناوم.

بڕوام نییە ئەو کِارە، ئەو جینایەتە لە دەستی بابێک، دڵسۆزێک خۆ نیشان دات، بێتە سەر شانۆ و خەڵک و نەتەوەی دوژمن بە خۆی خۆش کات. بە تایبەتی بۆ من، بۆ باوکم کە زۆر لە مێژینە لە سەر لانکەوە من بە شۆڕش و شۆڕش بە من بەخشراوین، من و شۆڕش یانی کۆڵاوکۆڵ جیابوونەوەمان لە توانا بەدەرە، باوکم ئەم کارە ناتوانێ بکات، خۆ من مت‌وموووری ئاڵ و گۆڕ نیم هەر کات و سات بە مەیلی خۆی بمخاتە جانتای تاجرێک و موشتەری‌یەکەوە. من مارە بڕەی شۆڕشم و بڕیارم لە سەر ئەوەیە خۆشەویستی من و شۆڕش خودایی‌یە و سروشتی‌یە، ڕیشە دارە، خۆڕستە ناجووڵێ و تێک ناشکێ، یا شۆڕش یا مەرگ، یا بووکی کوێخا سولەیمان یا گۆڕستانی کۆن. هەر کەس من دەفرۆشێ یان ویستم پێشێل دەکات بە هەڵە چووە، من شوێنم دیاریە. بڕیارم داوە، مەرجم بەستووە، هێزی باب، زۆری ملهوڕ و خۆشەویستی تازە ناتوانێ بمجووڵێنێ، کەللەم ببڕێ، بمفرۆشێ، بمبەخشێ. من و شۆڕش دوو ئەویندار، دوو مەم و زین، دوو خەج و سیامەند، دوو شەم و شەمزین و دوو قەر و گوڵەزەردین. لە مەرجم، لە ویستم، لە بڕیارم، لە هەڵبژێراوم، هەتا پێچاڵی مەرگ تا دوا هەناسەم بەربەرەکانی و پارێزگاری ئەکەم. باجی فاتم لەو کارە مەترسە، دڵت تەخت و خاترت جەم بێ. نابێ لەو بارەوە لەگەڵ شۆڕش بدوێی، با شۆڕش پێ نەزانێ. زووتر شۆڕش وەرگێڕەوە بەرەو ماڵ و چاوم پێ بکەوێ و خاتری جەم کەم.

بـاجی فـاتم بە بارێـک هەناسـەوە بەرەو مـاڵ گەڕایەوە و کەژاڵ هەزار ئەوندەی‌تریش پەژارەی ژاری تاڵی پێنۆشی.

کەژاڵ بێ حاڵ و تێک شکاو، شکایەتی دەروونی نازانێ بەرەو کامە قازی و خاوەن دەسەڵاتێ بەرێ. کەژاڵ قسەکانی باجی فاتمی پێ ڕاستەقینەیە، لە بەر خۆیەوە ئەڵێ ئەگەر باوکم بمفرۆشێ ئەبێ من چارەم چی بێ؟ بـاوکم نەزان و دڵڕەق و سەرەڕۆیە، باوکم بێ بەزە و خودا نەناسـە و بـێ بەڵـگەیە. دوو سـاڵە دایکم باداری دەست و مەچەکی باداوە، هەڵست و کەوتی بە زەحـمەتە، بەڵام باوکم ئاوڕی لێ‌نەداوەتەوە. بۆ هیچ حەکیم و لوقمانێکی بەڕێ نەکـردووە و بـۆ هیچ داودەرمانێک و هیچ چاک و پیرێک هەنگاوی هەڵنەهێنـاوەتەوە. دڵڕەقـی وا دوور نییە منیش بفرۆشێ و بە قوربانی ویسـت و ئـاوات و نەوسـی خـۆییم بکا. دەکرێ بە ئاوم دادا، لە ئاگرم هـاوێ و هەناسەیێکیشـم بەدوودا نەهـاوێ. بەڕاسـتی ئەوانە بـاب نـین، مڵـۆزمن، دڕنـدەن، چـاوچنۆکن، هەوەسـبازن، نە ویژدانیان هەیە نە خودا. ئەو جۆرە باوکـانە نەخۆشـین، ئـازارن، پڕمەترسـین، ئەبێ بمرن، گۆڕبەگۆڕ کرێن، سزا بدرێن، دەبێ تێبگەن، حاڵی کرێن، کە کـچ گیان‌لەبەرە، خاوەن دڵە، ئینسـانە، نافرۆشـرێ، کـچ فرۆشـتن تـاوانە، جـورمە، سەمەرەیە، داهاتووی ڕەشە. دەسـتەچیلەی دووبەرەکـی و دژایەتـی‌یە، یاسـای عەشیرەتی و عێلی ئەبێ بڕووخێ، باوی بەبادا چێ و شێوەی ڕەشەوە بێ. ئاخ، سکاڵا، پەنا بردن، هاوار بۆ کێ، بۆ کـامە کەس، کـامە یاسـا، کـامە خێرخـواز، کامە قازی. کێ هەیە بنووسی ڕاسێ بۆ هەژار، بۆ فرۆشـراو، بـۆ بـێ بەش، بـۆ چارەڕەش ...

## بووکی گۆڕستانی کۆن



کێ هەیە، کامە کەسە قۆڵ هەڵماڵێ، خەنجەری دەسک سپی، لە هێرشی میر و بەگ نەترسێ، ڕانەچڵەکێ، هاوار بکا و ڕایگەیەنێ بە نووسراو، بە گۆڤار، بە دەنگ، بە هەڕەشە، بڵێ کچ فرۆشتن، ژن بە ژن، تاوانە، سووچە، لە گۆڕنانە ئەو سەرەی سەری ئەو سەودایە دەگێڕێ گێرە بەتاڵە. دەبێ بشکێ، لە لەش وەبێ، ئەوەی پێی وایە زۆری خەنجەر، زێڕ، پارە، هێرش، هەڕەشە ئەتوانێ کیژۆڵەیەک دەستەمۆ بکات، کەوی بکات، لە ویستی خۆی لاڕێ بکا، دڵخوازی خۆی پێ بەجێ هێڵێ، لێی نەزانیوە، زەینی بەهەڵە چووە، خراپی لێ حاڵییە، چاڵی بۆخۆی هەڵکەندووە، ئاگری لە خۆی، لە ژیانی، لە سامانی هەڵگراندووە. شەرتە من هەر لە ئێستاوە بۆ تۆڵە براسێم، قۆڵ هەڵماڵم، نەترسم، شێرە کچ بم، لە ویستم، لە ئەوینم دیفاع بکەم هەتا سنووری مەرگ، تا دوا هەناسەم ئەبێ ئاگرێک هەڵایسێنم، چرەچەمانی بۆچەکی لووتی مێژووی پێ سەربەرز بکرێت. ئەبێ قوربانی‌یەک وەڕازێنم و خوێنێ بڕێژم و بووکێ بسووتێنم کە زەندەقدار زەندەقی بچێ و مێژوو پێیەوە بناڵێنێ. ئەبێ بۆ کچانی شەرمن و فرۆشراوی دواڕۆژ ببمە ڕچەی خەبات و ڕێنوێنی. ئیتر من کەژاڵە شێت نیم. هەست بە حەسانەوەی گیانم ئەکەم. تا ئێستا دڵم تاریک و هەواڵی ڕووداوێکی بێسەر و بنی پێ دەور ئەکردمەوە، ئێستا کە هەموو شت ڕوون و بێ پەردە لەگەڵم ڕووبەڕوویە، گیانم بووژاوەترە، ترسی نووشتەنووس و ئاژاوەی نەحلەتیان سەر و دڵیان بەرداوم. سەمەرەی گومان و دڵەکوتە سەری لە سەر هەڵگرتووم، هەر وەک تازە لە خەو هەستابم، بزۆزی کچانە گیانی ئاخنیوم. هەر دەڵێی

نەبام دیوه نه بۆران. هەر دەڵێی بەرەو ئاوات، بەرەو زەماوەندی شۆڕش بەڕێوە دەڕۆم. حەز دەکەم هەر ئەمڕۆکە بەرەو زەماوەندی قالەزلە وەڕێ کەوم.

قارەمانیی خۆم بە جیهان نیشان بدەم. پێشینیان گوتوویانە مست لە مستی دەگەڕێتەوە. ڕاسان نیوەی پیرۆزی‌یە. ئێستە هەموو شت بۆ من ڕوونە و سەر و بنی خۆ نوێنە. بۆ من هەموو شت، هەموو هیوا، هەموو ئاوات کۆتایی پێهات.

با هەتا ماوە فورسەتی هەیە بۆ لای دایکم، دایکی لاواز و نیوە گیانم وەگەڕێم. دەستی لەمل کەم، ئامێزی تێوەرێنم و گیانی وەبەرداکەم. بۆ ئاخرین جار ماڵ ئاوایی لێ بخوازم. با برای چکۆلەم بدوێنم و لە دڵڕەقی باب و چارە ڕەشی خۆم لەگەڵیان بدوێم. برا خوێن گر و خوێن ئەستێنن. دەبێ تێیان بگەیەنم کە ئەوە من نیم خۆم دەسووتێنم و مێژوو خوێناوی دەکەم، ئەوە نەزانی و نەوسنی باوکی ناحاڵی‌یە، بەڵام نە باوک بەڵکوو دز، کچ فرۆش، خوێنڕێژ، کتکە نەوتینە.

## سوارەکانی سوڵتان ئاغا و گوێزرانەوەی کەژاڵ:

کەژاڵ ئاخرین شەویەتی. لەگەڵ دایکی دڵ بەخەم و نەخۆشی سەر ئەکاتە سەر سەرین. بەڵام نەک خەو و پشوودان، بەڵکوو بۆ ڕاز و نیاز لەگەڵ چارەنووسی، لەگەڵ خوا، لەگەڵ ئەوین بۆ شین، بۆ فرمێسک ڕشتن، ماڵاوایی لە ژین، لە ئەستێرەی گەش، لە حاسمانی شین، لە هیوا، لە تەمەنی جوان، لە شۆڕشی خۆشەویست، شەوی ڕەشی کەژاڵی چارە ڕەش بەرەبەرە بزەی

ڕووناکی تێدەگەڕێ. مەلی وردیلە لە سەر سوێگان گڕوگاڵی خۆیان نیشان دەدەن و ڕۆژی ڕەشی تەم و گومانی کەژاڵ لە نێو گەواڵی ڕاست و درۆدا سەر وەدەر دەنێ. سوارەی پێش قەراوڵی خەنەبەندان بە چوونی کەژاڵ دادەبەزێ، تاو هەڵاتووە بەڵام هەتاوی بێ تین. ڕۆژ سەری لە سوێیە بەڵام ڕۆژی ڕەشی کەژاڵی هەژار. چاوی کەژاڵ بە مۆلەق وەستاوە و لە ڕوانین تۆراون.

باریکە ڕێگای بەستێن لە ژێر پێی سوارانەدا پێشێل بوون، شێوەردان بە سمی ئەسپی شێ وەرد درانەوە، دەنگی هەوهەوی سواران ناڵەی دەهۆڵ و زیڕەی زوڕنا، بۆ سەر هەواران پێ هەڵگەڕاون. بەندی خەنەبەندان، بەندی دڵی کەژاڵی هەڵکەند. بە دەستووری ئاغا تا نیوەڕۆ دەستی دیلان لە یەک گرێ دران. بریقەی گۆبەرۆک و هەیاسەی زێڕین لە کورتەک و سمێڵی ڕەش بوونە میوان. قام بێژ و دەهۆڵ کوت و زوڕناچی بە شاباشی شایی کەژاڵی چارەڕەش خەنی کران. ژنانی سەر سپی و بەربووکی لە بووک سوورتر سیپاڵی سووریان وەبەر بووکێ داکردن.

کەژاڵ ڕێ چار و دەوری باڵە فرەی لێ دەخراوە. بۆ ئەوەی کەس لە نهێنی و ڕاسانی هەناوی نەگا و جاسووس و سیخوڕ ڕیسەکەی نەکەنەوە بە خوری، بە بزەی کچانەوە لیباس لە بەر دەکا و لە شایی مەرگی خۆیدا پێیەک بەزەویدا دەدا.

کەژاڵ پێش هەموو شتێک قاپی بێنزین و ژاری مەرگە مووش لە نێو بەر و بوخچەی خۆیدا جێ دەکاتەوە. کەژاڵ لە بەر خۆیەوە دەڵێ زۆر باشە ئەوا

شایی خۆشم چاو پێ کەوت و لیباسی بووکیشم لە بەر خۆمدا دیت، ئیتر چیم کەمە، ئەوە ئاواتی کچۆڵەیەکە. بەڵام دەزگیرانم تەمەنی لە پەنجا زیاترە.

کچی چووکی لای مێردە. منیش لە شازدە ساڵە سەرنەکەوتووم، بەڵام زەبری پارە، زۆری ئاغا، باوکی نەوسن و بێ بەزەیی، ئەیانەوێ بە دەستی پیسی قۆرغەوانێک میوەی کاڵی من بڕنرێ و هیوای کچانەم گۆڕ کرێ و شووشەی حەیام وەبەردێ کەوێت. بەڵام بە هەڵە چوون، شەیتان سەری لێشێواندوون، ئەبێ تێیان بگەیەنم کە پەنجا کیلۆ چەند باتمانە. بەڵام عەیبی نییە با ئەمڕۆکەش بای باڵی خۆیان بدەن و سفرەی خۆیان پێ ڕاخەن. بەیانی هەموو شت، هەموو نهێنی پەردەی لە سەر لادەدرێت.

کورسی بۆ سواری بووکێ ڕازاوەتەوە، پارە و شیرینی لە سەر سوێبانەوە بە سەر کورسیی بووکێدا هەڵدەڕژێت. گۆرانی، گۆرانی بێژان (زاوا خۆش بێ بووک هاتە دەر) هەموو دەراوی کردبوونە قەنداو، حەمە سوور، حەمە سووری کچ فرۆش، باوکی کەژاڵ، قۆڵی کەژاڵ ئەگرێ و بەرەو سوار بوون وەڕێ ئەکەوێت. کەژاڵ ئەڵێ باوکم قۆڵی گرتم و مێزی دڵدانەوەی تێ وەرێنام بەڵام لە ڕەنگ و ڕوخساری تووڕەم، لە لێوە لەرە و ددانە کرمەم زەندەقی تۆقاوە، لە کردەوەی خۆی پەژیوان و ناڕازییە. بەڵام تازە تێپەڕیوە ئەوەی نەدەبوو بیکات کردی و تەواو کرا.

باوکم فرمێسکی تاڵ و سوێری هاتوونە ڕوو و بە ڕووزەردیەوە گوتی: کچم، زووتر سوار بە و نامەردان بە باوکت خۆش مەکە، کچی باش بە و وشیار بە دوژمن تووشی چارە ڕەشیت نەکا، سەری باوکت نەوی مەکە، پێت خۆش بێ




و پێت ناخۆش بێ تۆ تازە بوویتە حەلاڵی موباشیر، هەمە کارەی ئاغـا، ئەوەش بزانە تۆ پێشکەش بە سوڵتان ئاغا کـراوی، لێـرە بەدواوە ئـێمە لەگەڵ خەڵـک فەرقمان هەیە، شـەکەِ زەکـات و تەغـار و ڕبە و پەڵە و پووتمـان وەرنـاگیری. زەکات و هەوارانە و ئاوەخورانەمان پێ بەخشـراوە، بەڵام بە چـاوی تـۆ کەژاڵ گیان، لەوە بەولاوە من دەحەسێمەوە و ئەویش لەبن سێبەری تـۆدا، سـێبەری چاوی جـوانی تـۆ کەژاڵ گیـان، کەس وەک تـۆ زەماوەنـدی بـۆ نەڕازاوەتەوە. ئەوندە سوار و پیادەی بۆ وەدەر نەکەوتووە، کچانی ئاوایی ئێرەیی بە تۆ دەبەن، ئاوات و ئارەزووی جل و بەرگی تۆ و زێڕ و زەمبەری تۆیانە.

کەژاڵ: «بەڵێ، بەڵێ، باوکی نەزان، باوکی ناپیاو، کچ فـرۆش و هەوەسـباز، بێ بەزە، تا ئێرە باوکم بووی، بۆ خۆشی تۆ، خـۆم لە هـیچ ئەرک و ڕاسـانێک نەپاراستووە، لام وابوو تۆش وەکوو بابێک و خاوەن ڕوحمێک ڕاهـاتووی، خـۆم بە خۆم ئەسپێرم. نەمزانـی بە پەلە و پـووت و هەوارانەم دەفرۆشـی، نەمزانـی فیدای نەوسی خۆتم ئەکەی، نەمزانی ئەمکەیتە ماری شێخ هۆمەر، لە گەردنی دایکم ئەهاڵێنی، ئەتۆش بزانە باب نی و من کچی تۆ نـیم، ئەتـۆ خـوێنڕێژی، بەو زووانە ئەبێ تێبگەی کە ناتوانی بمفرۆشی، سەرەڕێ بە هەستم، بە ئەوینم بگری و لە چاڵی ڕەشی نەوسی خۆتا بمخنکێنی، تێدەگەی، بەڵام کەی؟ کاتێ تێدەگەی کە نە من ماوم نە تۆ، تۆ گورزی خۆت وەشاند، ئەوجار نۆبەی مـنە، بە کەمم مەگرە و ئێستا سزای کردەوەی نالەباری خۆتان وەرگرن، بـاش بـزانە تۆڵەی من بەردی من بەردی گورچووبڕە، نە بەرگری لێـدەکرێ و نە پـارانەوە کاری لێ دەکات. بڕیارم داوە، مەرجم بەستووە، دەبـێ بەردی بنـاغەی ژیانمت

وەدەرکەوێ. تامی تاڵی و ژاری مارت پێ بنۆشم، شـایيت لـێ بـکەم بە شـين وژيانت بەمەرگ بگۆڕمەوە، ئيتر قۆڵم بەردە و چاوەڕێی هێرش و تۆڵەم بە.

## سواربوونی کەژاڵ بۆ ماڵی زاوا:

کەژاڵ: «زۆر باشە ئەوا سواربووم. ئاواتی کچێک، ديتنی بووکێتی خـۆيەتی، منيش ئەوا ديتم، ئيتر چيم کەمە، ياسای بووک ئاوڕدانەوە لە سێ کەڕەت دا، بە مانای حواحافيزی، ماڵ ئاوايی لە ماڵی باوان، لە دەستە خوشکان، لە خاکی ئاوايی. بەڵام لە بەختی ڕەشم شکايەت دەکەم کە من بێ باب و بـێ بەش لە هەموو دڵسۆزیيەکم، ئيتر ماڵ ئاوايی لە کێ؟ لە کـامە دڵسـۆز؟ مەگەر بڵـێم مـاڵ ئـاوايی لە ژيـان، لە خۆشـی، لە تەمەن، لە ئـاوات، لە هەمـوو شـت، لە شۆڕشـی خۆشەويسـت، بـۆ هەميشـە، هەتاهەتـايە تـا بـازاڕێکیتر، تـا مەحشەرێکیتر، هەستانێکیتر، جيهانێکیتر، ديسـان دووزەلە و نـايە گيانيـان خراوە بەر، زورنا و دەهۆڵ و دمەک ژينی نوێـيان نوێتر کـردەوە، سـوارە سـوار بوون، لە ژێر چەمۆڵە و سمی ئەسپاندا چەرمی زەوی چەرمەسەری بـۆ ژيـاوە، گەڕی گۆوەند و سەما تۆزی زەوی بە چاوی گەشی سەمادا کرد.

کەژاڵ بەرەو مـاڵی زاوا لە ئاوايی ئـاوا بـوو، لە ژێـر چارشـێوی سـوورەوە فرمێسکی خوێن ئەڕژێنێتە سـەر زەوی. کەژاڵ لە هەزارەی خەيـاڵا ئەيگـوت: «هەر بەيانی زووتر لەم وەختە، جل و بەرگی سووتاو و مەيتی کەژاڵ، کەژاڵـی بێ گيان و بێ ناز، بـێ دووزەلە و گـۆرانی بەرەو مـاڵی بـاوان، بەرەو باوەشـی شـۆڕش، بەرەو گۆڕسـتانی کـۆن ئەگەڕێـتەوە. بەڵام بە جێگـای سـەما و





هەڵپەڕکێ، بە جێگای بەستە و بەندی بـووکێ، شـین، هەنیسـک، فرمێسـک، بەخۆدادان و پەشیمانی، خۆڕنین، تازیە باری.

کەژاڵ لە دەریای خەو و خەیاڵی ئاڵۆزدا نوقم ببوو، سەری شـکایەتی بەرەو حاسمان بەرز کردەوە و ئاوایی ماڵی زاوای کەوتە بەرچاو.

کەژاڵ بە دیتنـی ئەو گونـدە، گونـدی مـاڵی زاوا، مـوڵکی سـوڵتان ئاغـا مچوڕکێکی گورچووبڕ جەرگی بڕی و ئەوندەی‌تریشـی تاسـاند. کەژاڵ سـەری هەڵێنا و لە ئاوایی ڕوانی، گوندێکی ڕازاوە و لەبەردڵان، بەر و هەیوان خاوێن و بێ وێنە، سەربان و کۆڵان و باریکە ڕێ لە خەڵک ئاخنراو، دیلان و هەڵپەڕکێ پەڕی لێ هەڵاویشتووە و ڕیزی گەورە کچ و ژنانی جوان بە سەماوە بەرەو من دێن، جەماوەرێک پووڵ و پارە بە دەست چاوەڕوانی دابەزینی بووکن. زەوی لە ژێر پێ و پلی تەماشاچیاندا لە چاو چووە، لە هەموو گەڕەک و کۆڵانێکا پاڵە و پەستۆیە و پێ لە پێ هەڕەمەیەتی. ئاوێنەی باڵا نوێن نانی لە ڕۆناودا خووساوە و ڕووبەڕووی ڕوومەتی جوان ڕاگیراون. بە هام و شۆی دڵتەڕ و دڵدار و شـایی یە خۆیان، ئەو گۆوەنـدە لە خۆشـی‌دا خەنی و لە خۆبـایی بـووە و خـۆی بە بەهەشتی گۆڕین ئاڵ و گۆڕ ناکا و چاوی ڕۆژی لە بەرچاوە بڕکەی لاوان چـاو لێـک نـانێ. ڕەشـــبەڵەک گەڕی گەرمە. هەر دۆیە و بەدەس دۆخـــوازانەوە، قالەزلەی زاوا لە خۆشی‌دا ماسیوە، سەر و سمێلی بە بۆیاغ نوێ بۆتەوە ناهەقی نییە، ڕەزی بە بەر و دێـبەری بە سـێبەرە. پـازدە سـاڵەیەک بە تەڵەی پەنجـا ساڵەیەکەوە بـووە. کە واتە هەقیەتـی بماسێ و سـێبەری خـۆی نەناسـێتەوە، هەقیەتی ئەوندەی‌تریش خەڵک لە خۆی وەخڕ بکاتەوە و سـەروەت و سـامانی

خۆی وەبەر بادا. تا بەڵکوو دڵی کەژاڵی هەژار وەحاوێنێ و هەر جۆرێک بێ دەستەمۆی بکات و کەیفی پێ تەخت بکا.

بەڵام خراپ تێگەیشتووە و لە هەڵەدا. سامانی خۆی بە ئاو دادا و بە بەردی نەزانی ئەژنۆی خۆی شکاندووە. سمێڵی بۆز و ڕوومەتی تورت، کێرد و پەنیر، یا سیر و مار.

دەبێ زووتر لەو شۆکە، زووتر لە بوومەلێڵە، زووتر لەوەی کە گورگی برسی شاڵاوم بۆ بێنێ، قالەزلە حاڵی بکرێ کە کچ کڕین و شایی بە زۆری یانی چی؟ دەبێ سوڵتان ئاغا باش بزانێ ڕەش بەڵەک و دیلانی پڕ لە پیلان بێ ئاکامە و پاشە ڕۆژی بێ کەڵکە. دەبێ پاش تاوێکی‌تر نە کەژاڵ بێ و نە شایی. بە جێگەی ڕەش بەڵەک، شەوەزەنگی شین، بەخۆدادان، خۆڕنین، پەکوو پەکوو، تف و نەحلەت و پەشیمانی بێ. بەڵێ ئێرە ماڵی زاوایە و نۆبەی دابەزێنی بووکە. دەبێ دابەزم و بچمە نێو گۆڕخانە. کەژاڵ زیاتر لە چەند پشوویەک دەرفەتی ژیانی نییە. باشە ئەوا دابەزیم و زینی سواریم بە جێ هێشت. لە دوو لاوە قۆڵیان گرتووم، ڕێز و حورمەتم لە ژمارە چۆتە دەرێ، دەورەم بە سەر سپی و کچانی جوانی ئاوایی تەنراوە، هەموو چاوێک بە چاوێکی سەیر تەماشام ئەکا. نزیکە لە ژێر هەرەسی چاو و برۆیاندا برشم هەڵێ. ئەو خەڵکە هەر دەڵێی نە قەت بووکیان دیوە و نە بووکنی. تەنانەت بۆ تاوێکیش چاوم لێ ناترووکێنن. لایان سەیر و سەرسووڕهێنەرە. کەژاڵ و قالەزلە! بێچووە هەوێردە و هێلانەی داڵە ڕەش؟! لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە بە لێ ڕوانینم گەش نین. بەربووک و ژنانی دەورووبەرم پێکەوە خەریکی سرتە و

ڕاز و نیازن. جاروبار لە من ئەڕوانن و ملیان بەلاوە ئەنێن. هەناسەی سارد هەڵدەکێشن و ئەیانەوێ ڕاستییەک بدرکێنن نەگوتراوێک بڵێن و زوڵم لێکراوێک نیشان بدەن و ئەویش ڕەنگە کەژاڵی چارەڕەش، کەژاڵی جوانەمەرگ.

کەژاڵ ئەیەویست بۆ حەسانەوە دەوری چۆڵ کرێت.

کەژاڵ بۆ شوێنەونکە ڕوو لە ژنان و کچان ئەکا و ئەڵێ:

بەڕاستی زۆر کفت و کوتراو و کۆڵەوارم. سواری زین و پێچ و پوڵوچی ڕێگا، ڕێی دانیشتنی بۆم نەهێشتووە، ڕەنگە ئەوەش بزانن کە شەوی پێش، زرمە و زیلەی خەنەبەندان ماوەی خەوی پێ نەداوم و تەنانەت خەونووچکەش مەرحەبایی لێ نەکردووم، ئەبێ ئیزنم بدەن و چاوێ بە خەو نەرم کەم. ئەبێ دەورم چۆڵ کەن و کەمێک پشوو بدەم، ئەبێ بمبوورن داواو لێدەکەم بێ عاریم بە دڵ نەگرن. داوای کەژاڵ بەجێهات. ژنانی ماقووڵ و شەدە بە سەر کەژاڵیان بە جێ هێشت، پێخەسوو و خاسەکابان و بەرموور لەمل بەرەو سەیری سوارە و گەڕی هەڵپەڕکێ وەڕێ کەوتن. وەتاغی ماڵی سوڵتان ئاغا سەروژێر و هاڵی لە خان و نۆکەر و لاو و قۆز و پووڵدار هەر جمەی دەهات. تەقەی قەند و زریکەی ئیستیکان، بۆ چەکی کەباب و قاقای خواردن و پێداکردن نەوسی مردووی پێ دەڕاسا. مزگەوت و سەربان و بەرهەیوان لە لاوی خۆدێیی، لە سوار و پیادە، لاو و پیرە پیاو ڕاوەستابوون. کەس کەسی نەدەناسی، پاڵەپەستێ و خۆ ڕەپێش نان بایەخی پێ درابوو.

لە سەر سفرەی شایی کەژاڵ، باسی جوانی کەژاڵ و بێ وێڵی زاوا بــوو بە بنێشتە خۆشکەی سەرزار و زمانان و هەموو سەربەندی دەهاتەوە سەر چـاوی کاڵی کەژاڵ. هەر کەس بە هەوایەک لە شمشاڵی خۆی دەتووڕانـد و تـووڕەیی خۆی لەو کارە دەردەبڕی.

هێندێکی بە شانسی زاوا هەڵدەشاخین و هێندێکیش بۆ چارەڕەشی بــووک چاویان تەڕ ئەکرد. هێندێک پێیان وابوو کە زاوا بە هەڵە چووە و ئەو بووکە بۆ ئەو دانەبەزیوە و لەو وەرزە بەرهەمێک هەڵناگرێت. کەژاڵ نێچیـری بـازە و بە داوی قەل گیراوە. هەوێردەی ئەحمەدە و دیاری مەحموودە.

قالەزلە لەم شۆکە زیاتر لە تـام و بـۆنی بـووکی نـاچێژێ و خـاوەنی نـابێ قالەزلەی میراو و بووکیش گوڵی دیوەخان.

پێشینیان گوتوویانە «حاکم کەروێشک بە عەرابە دەگرێ» و تووکی ئەکـاتە نووشتەی خەو. کـورتی ببـرینەوە. لە سـەر سـفرەی نـان خـواردن لەمەڕ ئەو زەماوەنــدە ئەوەی نەدەبــوو بگــوترێ گــوترا و چارشــێو لە ســەر کارەســات هەڵدرایەوە. هێشتا ورگن و پیرەپیاوی نەوسن لە سەر سفرەی چەوری قالەزلە خەریکی زگ ئاخنین بوون، هێشتا لاوی قۆز و لەخۆڕادیو، هێشــتا پیرەپیـاوی شایی بەخۆ و دۆنەدیو دەستی دۆ و دۆخوازانیان بەرنەدابوو و دۆدانەیان لە دۆ پڕ نەکردبوو، هێشــتا گەڕی ڕەشــبەڵەک هەوڵـی گەرد و گـۆلی بـوو، هێشــتا دووزەلە و نایە لە ناو زوونگی خۆشیی‌دا شـایان بە ســەپان نەدەگـرت. هێشــتا قالەزلە بە دەست و پێ لە سەما نەکەوتبــوو و چـاوەڕوانی هەســتانی بــووک و

هەتاوی بەختی خۆی ئەکرد. هێشتا وەتاغی ئاغا بانکی قوماریان نیوە پڕ نەکرابوو.

لە نەکاو دووکەڵ و چرە چەمان خەڵکی ڕاچڵەکاند. هاوارێک لەپڕ گوێی خەڵکی داگیر کرد. گوتیان ماڵی زاوا سووتا، زاوا ڕیسەکەی بوو بە خوری، کەژاڵ بوو بە خەڵووز، بۆچەکی دووکەڵ ماڵی دڵی خەڵکی ڕووخاند، دەستی دیلانی پساند، دووزەلە و نایە، زوڕنا و دەهۆڵ قوڕ و قەپیان چنی. دیوەخان چۆڵ کرا، پەڕی قومار پەرپەڕ بە جێ ما و شووشەی شەڕاب و پلاو و گۆشت و جووجەڵە، تاجی و تولەیان وەسەر گەڕا. سەربان و مزگەوت بەبێ چۆلەکەکوژ مایەوە و پشیلە و پاساری بە کاسە و کەوڵی پڕ لە برینج خۆیان خەنی کرد.

هەموو کەس بۆ لای ماڵی بووکێ بۆ تەماشای سووتمانی چاوەڕێ نەکراو وەڕێ کەوتن بەڵام بەداخەوەماڵی زاوا هۆدەی جێ خەوی کەژاڵ ببوو بە چاڵی نمروود و بنکەی چرەچەمانی ئاگر. هێزی خەڵک، هێرشی پێمەڕە و بێڵ، وەسەرگێڕانی ئاو و سێڵاو بەهرەی لێوەرنەگیراو گیانی کەژاڵیان بۆ نەگەڕاوە.

پاش تێکشکانی گڕ و دووکەڵ ئیتر لە کەژاڵ، لە بووک، لە ژیان بێجگە لە مستێک خەڵووز و لاشەیەکی ساردەوە بوو، بەرچاو نەکەوت. ڕوونتر بڵێم کەژاڵ قەستی ڕۆژانی بەرووی لە ماڵی زاوادا مقەست کرد و مەرجی خۆی بردەسەر و گیانێکی پڕ لە وەفای بەرەو شۆڕشی خۆشەویستی بەڕێ کردەوە و قارەمانی خۆی نواند و جل وبەرگی سووری لە ئاگری سوور مارە برین. دەمی

باوکی نەزانی دەمکوت کرد و دەستی ملهوڕ و چاوچنۆکانی شکاند و ریزی ڕەشبەڵەک و شاییگرانی بە شین و شەپۆڕەوە گێڕا و بۆ هەمیشە ئاسۆگەی مێژووی لە تەمی پەژارە پڕ کرد. سفرە و قاپ و قاچاغ بێ ناز و هالۆز و پلۆز بێ نانخۆر و فەڕاش لە سەربان و بەر هەیوانان مانەوە.

دەهۆڵ کوت و زوڕناچی و نایەلێدەر لە ژێر سیلەوسوێ بانان هەڵتووتەکان. بووکێ ڕەنگ شپرزاو و بزرکاو و لێوبەبار وەستاون، کەس لەکەس ناپرسێ، ڕووداو بێچارە و سووتمان کاری دوایی پێهێناوە. هەرکەس دەیەویست خۆ ڕەپێشخا و لاشەی سووتاوی بووکێ بە چاوی خۆی ببینێ. چاو لە بەر ئێشی ڕووداو چوونە پشتی سەر. درگای جێ خەوی کەژاڵ ئاواڵەیە. لەشی کەژاڵ و لیباسی بووکێتی بە ئاوری بێ ئەمان وەها بە سەر یەکا قاڵ کرابوون کە جیا کردنەوەیان حەستەم و تەنانەت ئینسان لە تەماشا کردنی زەندەقی دەچوو. چاو لە بەر هێرشی فرمێسکان هەڵنایەن، گیان لە خەفەت پڕبوون و دڵ هەموو کەوتوونە دڵەکوتە و تووڕەیی خۆیان ڕاگەیاند. ڕۆژی ڕوون لە ڕوونی کارەساتی دڵتەزێن خۆی ڕانەگرت و بە هەناسەی ئاگرینەوە، بۆ بن پەسیوان پاشەکشەی کرد و لەگەڵ دوا هەناسەی کۆچی دوایی کەژاڵ بارونەی خۆی پێچاوە و لە سەر ترۆپکی کێوە بەرزەکان ئاوابوو و وەبالی مەرگی جوانەمەرگانی خستە سەر ئەستۆی شەوی ڕەش. شەو بالی ڕەشی خۆی ڕاوەشاند و خەڵکی بەرەو ماڵ گێڕایەوە و تەرمی بێ ناز و ژاکاوی کەژاڵ بە فرمێسکی گەرم و گوڕی قام بێژ و بەستەوانان بە شین و شەپۆڕی لاو و پیرەپیاوان لە مزگەوت میوان کرا.




کەژاڵ بۆ یەکەم جار بوو لەگەڵ پیاوان لە مزگەوت میـوان بـێ و لە سـەر گازەرای پشت رووبەڕووی پیاوان بە شەرمی کچانەوە خۆ ڕاکێشـێ. هەرچەنـد کەژاڵ ئەوشەوە لە گۆلی فرمێسکی پیرەپیاوان‌دا نوقم ئەکرا و بە دەستی ژنانی دڵ بە خەم لیباسـی سـپی لە بەر ئەکـرا و بە عەتـر و گـوڵاوی بـۆن خـۆش چاوەکانی گوڵاو پـرژێن کرابـوون، بەڵام هێشـتا گـرێ‌کـوێرەی دڵـی بە مـراد نەگەیشتووی نەکرابۆوە و چاوی تۆڵەی هەر لە بابی دڵڕەقی ئەگێڕا و ئەیویست زووتـــر بەرەو مـــاڵ وەڕێ کەوێـــت و پەیمـــانی پتەوتـــر لەگەڵ شۆڕشـــی خۆشەویستی نوێتر بکاتەوە و بۆ ئاخرین جار ماڵاوایی لێ بخوازێ.

مەلی شەو لە شـەقەی باڵی دا و کـۆرپەی بەرەبەیـان سـەردەمەی دڕی. کەڵەبابی سـپی بە مەرگـی شـەو قاقـای کێشـا. سـۆفیلکە لە سـەر بەرمـاڵان کۆمیلکەیان کرد. تەقەی زەنگی شەوێنی شوان شەقڵی شەوی شکاند. ئاسۆگە و بستۆ بزەی ڕووناکی‌یان تـێگەڕا و تەرمـی بـێ گیـانی کەژاڵ، بـووکی ڕۆژی پێشووتر بەرەو باوەخون، بەرەو گوندی خۆیان، بەرەو گۆڕسـتانی کـۆن لە دارە مەیت هەڵبەسترا.

خەڵکی بەخەمی ئاوایی، بووکی ڕۆژی بەرووتر لەگەڵ تەرمـی بـێ گیـانی، لەگەڵ گیانێکی سووتاو، پەپوولێکی بەهەشـتی بەریـن وەڕێ کەوتـن بەڵام بە جێگەی تەقڵە و جلیت، قاقا و تلی‌لیلان، بەستە و بەنـدی جـوان بە جـێگەی گۆرانی و خەنەبەندان، کـۆمەڵەیەک شـین، شـەپۆڕ، بەخـۆدادان، فرمێسـک و تووڕەیی لە کارەسات.

ڕێگە باریک و بەستێن قەراغ و چەمە. بێشە و قامیشەڵێن و چنارستانە بەرەبەیان ڕوون و هەوا فێنک و ئاونگ لەخەو ڕانەپەڕیوە.

شۆڕابەی شۆڕەبییان لە زۆربەی شوێنان تەرمی بێ گیانی کەژاڵ لە باوەش ئەگرن و ئاونگ بارانی دەکەن و گیانی وەبەر دەنێن و لە شەرت و مەرجی کیژێکی جوانەمەرگ، ئافەرین دەڵێن. بەرەبەیانێکی خۆش و بەرچاو و دڵرفێن، بەسێرە و سیلەی چاوی گوڵان هەموو چاوێکیان بۆ تەماشا ڕاکێشابوون. بەڵام چاوی کەژاڵ زوڵاڵ و خەو تێچزاو تەماشای زوێر و لە هەڵبڕان کەوتبوون.

چاوی مانی گرتووە و لە ڕوانین تووڕەن و بە شەرمی ئەویین، ئەوینێکی پاک نووساون و سوێند خۆری شۆڕشن و بۆ هیچ دیمەنێکیتر نایانەوێ بڕوانن. کزەبای بەرەبەیان، جاروبار بەشەرمەوە تارای سووری سەر تابووتی کەژاڵ هەڵدەداتەوە، هێدی و لەسەرەخۆ بە سرتەوە کەژاڵ دەدوێنێ و وەکوو مەلێک ڕاز و نیاز لەگەڵ کەژاڵ ئەکا و ڕووداویتریش بە گوێی کەژاڵدا ئەچرپێنێ. شۆبا ئەیەوێت بڵێ کەژاڵ گیان کۆچی سوورت موبارەک بێ، شۆڕشی خۆشەویست هاوڕێتە، لە گۆڕستانی کۆن چاوەڕێتە، شۆڕش بێ تۆ ژینی نەویست. ئەمشەو خۆی کردە قوربانی کۆچی سوورت. بوو بە قوربانی ڕۆژی زەماوەندی تۆ و قالەزلە. وا لە گۆڕستان چاوەڕێی تۆیە. کەژاڵ گیان دەبڕۆ فریای کوشتەی خۆت کەوە، زووتر پێ هەڵێنەوە تا لە گۆڕ نەخراوە، دڵت خاترجەم بێ لە ئاسمانی شینی شۆڕش دا هەر تاقە ئەستێرەیەک هەڵدێ ئەویش ئەتۆی، ئیتر مزگێنی بێ شۆڕش ئێوارەی ڕۆژی کۆچی تۆ دڵی





لەکار کەوت، ئێستا بە بێ دڵ لاشەیان بردە گۆڕستانی کۆن. دەبڕۆ خوات لەگەڵ شێرە کچ. سەد ئافەرین لە ڕاسانت، لە وەفات کچی کورد. شۆبا نایەوێ گیانی کەژاڵ هەروا ماندوو بەڕێوە بڕوات بۆ حەسانەوە، ئەیەوێ پێی ڕاگەیەنێ کە تۆڵەی کەژاڵ کراوەتەوە و هەقی بە تەواوی ئەستێنراوە. باوکی کەژاڵ، حەمە سووری نامەرد، پیس و چەپەڵ بە خەنجەری کوێخا سولەیمان هەنجن هەنجن کراوە. کوێخا سولەیمان باوکی شۆڕش بە تۆڵەی کوڕی خۆی، حەمە سووری لە گیان بێ بەش کرد.

کەژاڵ گیان، کۆچی تۆ نەخۆشی هاویشتە گوندی ئەستێرۆک، ئەستێرۆک بە خوێن ڕەنگی داوەتەوە. دووبەرەکی، هەڕەشە، دژایەتی سەری بە هەموو ماڵان دا کێشاوە.

کەژاڵ گیان، دەبڕۆ ڕامەوەستە. گۆڕستان قەرەباڵغە، دوو مەیت لەوێ چاوەڕێتن، شۆڕش لە لایەک و باوکت لە لایەکی‌تر. مەم و زینێک و بەکرە شۆفارێک. دەبڕۆ خوات لەگەڵ. بڕۆ و لە سەر تەرمی شۆڕش، گیانی خۆت وەحەسێنە، کوژراوی خۆت وەلاوێنە.

دەست لە دەست بۆ شاری جوانەمەرگان و وڵاتی خاوێن و ئەوین پاکان بۆ هەمیشە پشوو بدەن، بحەسێنەوە و یەکتر لە ئامێز بگرن. تەرمی بۆ کرووز و لەشی نیوە خەڵووزی کەژاڵ لە سەر شانی دڵ بەخەمان بەرەو ئاوایی ئەستێرۆک و گۆڕستانی کۆن وەڕێ کەوت.

گۆڕستان لە خەڵک پۆنگاوە. دەنگی شین و ڕۆڕۆ بەرزە، لە هەموو دەرکێک خۆڕنین و بەخۆدادان، هەڕەشە، هێرش، دژایەتی پەرەی لێ هەڵاویشتووە. هەر

دەڵێی ئەوشۆ لەشکری مەرگ لەوێ بەزیوە و مەلی بەختەوەری بار وبنەی پێچاوەتەوە، هەر دەڵێی دەستی تۆڵەی خوای هەژارێک ژاری ماری پێ نۆشیون و بایەقۆشی بێ فەڕ گەڕی خوێنی پێ فرۆشتوون، وادیارە ڕووداو لە سووتانی کەژاڵ ڕووداوتر و بەتینترە.

پاچ و پێمەرە لە دوو لاوە خەریکی هەڵکەندنی گۆڕن. شۆڕش و حەمە سوور بوونە قوربانی، بوونە گاوگەردوونی شەوی بەشوودانی کەژاڵ. دیارە هەناسەی کەژاڵی چارەڕەش و بڵێسەی دەروونی کچێکی فرۆشراو بەزەیی خوای گەورەی نواند. دەستی خوا تۆڵەی کەژاڵی وەرگرت. باوکی کەژاڵ نەگەیشتە میراوی، نەبوو بە هەمە کارەی سوڵتان ئاغا و وەبەر خەنجەری تۆڵە کەوت.

کەژاڵ خۆی سووتاند، شۆڕش موچوڕکی بە شوودانی کەژاڵ دوایی بە ژیان هێنا، حەمە سوور بە تاوانی پەیمان شکێنی وەبەر خەنجەر کەوت. مەلی بەختەوەری ئەستێرۆک باروبنەی گوێزراوە. بایەقۆشی دووبەرەکی و دژایەتی بۆ هەمیشە ڕەگ و ڕیشەی لێ داکوتا.

کەژاڵ و شۆڕش لە لای یەک خرانە گۆڕ. بە یەکتر بڕان، ئەو دوو ئەویندارە پاکە کەوتنە جیهانێکی‌تر، هەستانێکی‌تر، ڕاسانێکی‌تر. حەمەسوور دوور لە کەژاڵ و شۆڕش لە گۆڕ خرا، بە تف و نەحلەت گۆڕی داپۆشرا.

## سـواره و سـووره

پێشەکی

ئاورێک لە پیاوماقووڵی و بەبیرەکانی مێژووی کورد

ئەگەر بە چاوێکی مەند و بێچاووڕاو و بە هێزێکی مامۆسـتایانە لە کروکـار و شەوگوردی دەست و مەچەکی گەلی کورد وردەوە بین. وەیـان بـۆ هـۆرە و لۆرە و لاوک و بەیت و باوی بەیتبێژان گوێ ڕادێرین. و لە بنەماڵەی عێـل و عەشیرەت و سەرۆک هۆزان میوان بین. تەماشای کر و نەخشی تێـرِ و جەواڵ و چیخە ئەسمەرپێچەکان بکەین و لە دەسـت و چەک و چەکـمە و زەنگـاڵی سوارچاک و گەنجەکان ڕامێنین یان بە زستانی سـەخڵەت و سـۆڵ و سـەرما خۆ لە بەر کـوورەی مزگەوتـان وەبـووژێنین. و لە زار و زمـانی پیاومـاقووڵ و ڕدێنسپیان فکرین و بۆ نەزیرە و تیتاڵ و سەرگوزەشتەی قسەخۆشـان گـوێ ڕادێرین ئۆباڵی بۆ دەکێشین و دەڵێین گەلی کورد گەلێکی ڕەسەن و مـاکەدار و بەهۆش و زەق و زیندوویە. خاوەنی زاراوەیەکی هەراو و پاراو و بەلق و پۆپە. بـێئەوەی خوێنـدنەوەی هەبـێ لە مەنتیـق، بەیـان و بەلاغەدا و لە مەجـاز، تەشبیهـ و ئیستعارەدا بەشێکی هەرە ماقووڵ و پەسندکراوی هەیە.

زۆربەی گەلی کورد لە خوێندن و خوێندەواری دوور و تەنـانەت زۆربەیـان لە شارستانییەت و ژیانی نوێ بێبەشن.

سەرەڕای ئەوەش هێشتا ڕەگەز و ڕەچەڵەکی خۆیان لەبیر نەکردووە و داب و نەریتی باب و باپیر و جل و بەرگ و کورتەکی کوردانەیان نەگۆڕیوە، بە تایبەتی پیرەپیاو و قامبێژ و بەیتزانی وای تێدا هەڵکەوتووە، هەر خۆشە دڵی بۆ وەگری و لێی فێر بی و لەسەری بنووسی و گیانی پێوەحاوێنی و بۆشایی مێژووی پێبنەخشێنی هەر بۆ بەڵگە دەتوانین لە هەرێمی شاخاوی خۆماندا لە ناوچەی گەورکی موکری باوەگەورە نیشان بدەین.

لە زار و زمانی ئەو پیاوە گفت و لفت شیرینە، چیرۆکێک زیندوو وەکەین و لە بەر شەبەقی ئەو چیرۆکە دەرسێکی بەنرخ وەرگرین. بەڵام باشتر ئەوەیە پێشەکی باوەگەورە بناسین.

«باوەگەورە»

باوەگەورە، ناوی قادرە و کۆرپەی باوەشی ساردەکۆسانە و لە تەمەنی نەوەد ٩٠ساڵیدا لە گوندی یاغیان[1] کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی مەلازادان[2] بەخاک ئەسپێراوە. خوالێخۆشبوو لەبنەماڵەی عەزیزی خاڵندە و بە شەش پشت دەگاتەوە سەر شێخەی سوورکێوی دەس‌وەشێن. باوەگەورە هەروەکوو هەموو منداڵە کوردێک لە ناو پەڕۆوپاڵی شڕ و لانکی شەق و شکاوی کوردانەدا خڕەکە بووە. هاتووەتە ناو ڕیزی پیاوانەوە. بەڵام هەروەکوو زۆربەی پیاوە کوردەکانی پێگەیشتوو، چەرخ و خولی ژیان تووشی گەلێ ڕووداوی تووش و

---

١ گوندێکی چکۆلەی ناوچەی موکریانە، نزیک گوندەکانی سلامەت و گولۆلانی سەروو.

٢ ئەم گۆڕستانە لە مابەینی گوندی یاغیان و گلۆلانی سەریدایە.

هەڵدێرانی دەستی تۆسنانی کردووە و هەراوهوریای ساڵی «شێخی» «سمکۆ» و «مەلا خەلیل» و شەڕەکانی عەشیرەتی و هەرێمی، دەورێکی چەکداری باشی پێگێڕاوە و تاڵی ڕۆژانی شوانی و سەپانی و ساد و سەودا و کۆچ و باری، باری ناڵەباری ئەو سەردەمە دەورەیەکی‌تری ڕۆشنبیری و نەترسان و زبک و بڕی پێ حینجە کردووە:

ئەو پیاوە مەزنە هۆش و زەین و زانستی تا ئەو شوێنە بەرز بوو کە دەستی تاریفی پێ‌ڕاناگات. هەر لە تەمەنی منداڵی‌یەوە تا ناو بێشکەی گۆڕی پیرۆزی چی دیبوو، چی‌کردبوو یا چی پێکرابوو چی بە سەر کێ هاتبوو مووبەموو بە پێی بەڵگە و نیشانە هەمووی لە بیر مابوون.

زۆربەی جاران لە ناو دۆست و یاران لە بەربەڕۆچکە و سەربان و گوێ تەندووران خەڵک پووورەی لە سەر دەدا و ئەو کۆنە چیرۆک و وردە بەسەرهاتەیان بەتاموخوێ‌تر لە خوێی چێشتان پێدەگێڕاوە. ناوبراو لەو ئاخریانەدا ماڵۆچکەیەکی گەرم و کوردانەی پێکەوە نابوو. لە گوندی یاغیان سفرەی میوانداری و بەرماڵی خواناسی لێ ڕاخستبوو. کوردانە ژیا و قسەخۆش و ڕووخۆش و بەتام و خوێ دەژیا و تا هەشتاوپێنج ساڵ تەمەنی خۆی لەبیر بوو. ئەو پیاوە پیاوناس و گیاناس و نەخۆشی‌ناس و سەردەرچوویەکی خول و زەمانی خۆی بوو. ناوبراو بۆ ئەوەی پیاوی نەزان تێگەیەنی و هەڵەوپەڵەی قەڵس و قۆڵان هەڵگەڕێتەوە، دەم و جێ مەتەڵ و کورتە چیرۆکی وای بەدەمدا دەهات، مردووی تێدەگەیاند و نووستووی وەخەبەر دێنان. هەر بەو کورتە نەزیرە و قسە بەتامانە خەڵکی زۆر بەرەو ژیان ڕاستاویژ دەکرد و لە

هەڵە و هەڵخلیسکانی دەگێڕانەوە. یەکێک لەو چیرۆکانەی کە پیاوی تێروپڕی لێدەترسان سەرگوریشتەی سوارە و سوورەیە کەوا مـن بە قەڵەمـی خـۆم لە زمـانی ئەو زمـان ڕەوانەوە دەیهێـنمە سـەر کـاغەز و گیـانی وەبەر دێـنمەوە. باوەگەورە هەزاران بەیت و باوی ئاوای لەگەڵ خۆی خستە گۆڕەوە و لەکـیس ئێمەی کوترەخەم[1] و بەجێماو چوون، هەزار ڕەحمەت لەگـۆڕی بـێ و لەگەڵ خێری خوا هاوباوەش بێت.

«سوارە و سوورە»

«نانی گەنم شاخدارە»

سوارە، پیاوێکی ڕێکوپێک و بەدیمەن و بەرچاو بوو. کەم کەس دەیتـوانی تێر بەچاوان لێی بڕوانێ و بڕیاری هەڵوەشێنێتەوە ناوبراو مەرد و میوانگـر و سفرەپان و قسە چەور و بەبەخشش بوو. لە ناو چوارچێوەی ژیاندا خەنی و بێ کەمایەسی بوو. ئەسپی بزۆز و ویزەنگـی زێـڕین و چەکـمەی بەمـامزەدار هەر لەوی دەکاڵاوە و کەسی‌تر.

کلێـتەی کـوردانە و ڕانـکوچۆغەی سـوورگوێز و خەنـجەری مشتووسـپی ئەوندەی تریش سوارەیان لە ناو دڵاندا خۆشەویست و ماقووڵ کردبوو جوانی و جوامێری سوارە لە ناو عێل و عەشیرەت و هۆزاندا ڕیشەی داکوتابوو.

دەسـێ نەبـوو لە مەڵبەنـدا، دەسـتی بـادا و بـا نەبـوو لە کۆگـای ویسـتی پووشکەیەک ڕامالێ. دێو نەیدەتوانی بە مۆڕەوە لێی بڕوانێ و بڕیاری هەڵبڕێت.

---

[1] کەمتەرخەم، بێموبالات، گوێپێنەدەر.




خوێنگری خوێنان و پیاوماقووڵی سەر ڕووداوان بـوو. گـورگ و مەڕی پـێکەوە پاڵێن دەدا و فیلی بە موو چەواشە دەکـرد. ئەو لاوە شـیرین ژیـاوە، مـامێکی هەبوو پیر و لەرزۆکِ و لەکارکەوتوو، بەڵام بەهۆش و هێواش‌بێژ و بە ئەزموون و سەردەرچوو.

بەڵای پیـری و کۆسـپ و قـۆرتی تەمەن دەسـی پـێ لە داوێنـی سـوارە وەرێنابوو و وەکـوو پەنـابەرێکی بێـدەرەتان لە سـەر سفرەی سـوارە دەژیـا و چاوەڕوانی لە مردن بوو. پیرە پیاو ناوی «وەیسە» بوو. لە پسپۆڕی و خواناسـیدا لە وەیسی ماهی دەشتی بەجێ نەمـابوو. وەیسـە لەو شـۆخە پیـاوانەبوو کە لە کـاتی خـۆی خێـوی شـاخداری لە گێـرە دەکـرد و حەزیەی دووسـەری سەمەندۆک[1] دەکرد.

بەڵام گەڕی پیری نزم و نەوی لە سەر زەوی تووشی بێنـازی و دەسـتندە خۆری کردبوو. لەگەڵ سوارە، هەناسـە سـارد و بێـدەنگ و دەسـەڵات دەژیـا، سەرەڕای ئەوەش زۆرجاران سوارەی لە سەر لێوی کەنـدەڵانی هەڵە و هەڕاڵـی دەگێڕاوە. وتە بەنرخەکانی بەو شێوەیە دەسپێدەکرد. دەیگوت کوڕم سواره تـۆ هێشتا گەنجی و بێ ئەزموونی، وریا بە، نانی گەنـم شـاخت لـێ‌نەدا و ورگـت نەدڕێ. کوڕم بەڵای هەڕاڵی بێ دەرمان و دوکتورە و مانی بەبێ سامان و پـارە نەمانێکی پڕ لە عەیب و عارە. کوڕم هەتا هەتە بەرزی و هەوی، فەقیر کەوی، نزم و نەوی. ئەبێ ژیر بیت. تیری دەستت لێ نەوەشێنێ و نانی گەنم شـاخت وەبەر نەدا و گاجووتـت بە گیسـک پـێ نەبەخشـێ و نەزانـی تووشـی تەڵەی

---

[1] دارێکی باریکە، بەملی سەگەوە دەبەسترێتەوە هەتا فێری ڕستە دەبێ.

هەڕالیت نەکات. پێشینیان وتوویانە نانی گەنم شاخدارە و پیاوی تێر لە هەڵدێران نزیکە. هەروا گوتوویانە، تێر تلێک بدا ئەستۆی ورد دەبێ، بەڵام برسی سوورێک بدا هەڵدەستێتەوە.

کورم ڕۆژی ڕوون شەوی ڕەشی بەدوودا دێ و بە ماڵی زۆر هەڵمەخەڵەتێ. دۆستی سەر سفرە، بە سەفەری بزانە و لە گرێ و گۆڵی ناو ژیان و ژانەسەری سەردەمی پیری بێبیر مەبە.

لەم ڕۆژانەدا بیستوومە ئەتەوێ داوای عاسەخانی کچی کەسکە بکەیت و هەیاسەی تەڵا و تاس کڵاوی موسلی بۆ بکڕیت و زەنازەنای زەماوەندی بۆ وەڕازێنی. ئاژاوە بخەیتە ناو ماڵ. ماڵی خۆت بکەیتە جێگەی ئاشی دەوەنە ئاشی و شووشەی سام و شکۆی خۆت لە بەردی بێناوی دەی و بۆ هەمیشە کردە پەشیمان و ماڵ وێران بی. هەروەکوو مامەی خۆت پەنابەری قوون ئاو و تەندووری ماڵان بیت. ئەم کارە هەرگیز نابێ بکرێت. ئەگەر هەر لە کەری شەیتان دانابەزی، عاسەخان لفی تۆ نییە و بە سێ ساڵ تەمەن تۆفیرتانە. ئەویش کێ؟ کچی کەسکە.

هەموو کەسێ کەسکەی ناسیوە، دەڵاڵ و کتکە نەوتینەیە. کوندەبووە، وەیشوومەیە. کەسکە هەر ئەو ژنەیە کە مەرگەمووشی بە گەرووی بایزخانی مێردیدا کرد و ئاژاوەی خستە ناو ئاوایی و هێشتاش بۆچەک و چەرەچەمانی هەر نەبڕاوەتەوە. عاسەخانیش کچی ئەو دایکەیە «دایکان ببینە و کچان بخوازە.» کورم ئەو کارە بۆ کردن نابێ و ئەبێ نەکرێت.

مام وەیسە حەکیمانە و پیرانە بەهەزار و یەک بەڵگە، ویستی سوارە لەو سوارییە دابەزێنێ و لەو ژن هێنانەی پەشیمانی وەکات. بەڵام بەڵای هەڕاڵی و پارەزۆری بەحریکی بێ بوار و هەڵامەتێکی بێ دوکتور و دەرمانە. هەر وەیسە گوتی و سوارە نەیبیست، قسەی مامەی شکاند و نانی گەنم هەڵیمساند. ساماندارێ، داری هاری خستە دەست.

خولی گۆڕان باری ژیانی گۆڕی.ماڵی تەفر و توونا کرد و کلێتەی بە تیلاکی سەریەوە ناو بەرەو زەماوەندی عاسەخان وەڕێ کەوت. زەماوەندی پڕ لە زناڕەنای بۆ ڕازاندنەوە. زەوی لە ژێر سمی ئەسپی بووکێی زۆر و زەبەندەدا کەوتە سکاڵا و بووک دابەزی و ڕۆژی ڕەشی سوارە لە ئاسۆگەوە سەری هێنایەدەر، نەگبەتی باوەشی تێوەرێنا.

وتەی مام وەیسە، هاتە دی. نانی گەنم شاخی وەبەردا و سوارەی لە کراڵی هەڕاڵی دابەزاند. ناکۆکی ناو ماڵ و دەمەتەقەی دوو هەوێ سێدارەی ژانەسەری بۆ هەڵاوەسی. کوڕ و بووک و باب و دایک، ڕووبەڕووی یەکتر ڕاپەڕین. مرقە و مرخێش مرخێش گەیشتە دار و کوتەک و تۆران و لێک پسانی شیرازەی ماڵ و مناڵ و کوڕ و باب و دایک.

زۆری پێنەچوو میرەماڵ نیری کەوتە عەرز و سوارە سەری کەوتە بن بەرداشی دەردی سەری و مەڕ بێ شوان و بێچوو بێ کابان و شوان بێ شێو و قاپ و قاچاخ و چینی چەنەیان کەوتە بن ژەنگ. سوارە هەناسە سوار بەرەو هەڵدێری نەداری بەڕێ کەوت.

کۆتره جوانەکانی سوێبانی دیوەخـان پەڕەوازە بەرەو چیـا کۆچیـان کـرد. پشیلەی مشک خنکێنی ناو ماڵ، پەڕەوازەی ئێر و ئەوێیـان بـوون و کاسـەی نانی بوو بە مۆڵگەی پاشای مشکان.

تاژی ناسک و نازدار لە نووسکە نووسک و قەڵەمبـاز و خۆڕانـان کەوتـن و بەرەو گورگەمێشی و دەسپیسی ڕۆیشتن. میوانی سەرسفره و دۆستی پڵاوخۆر سەری سوارەیان سووک کرد. سـوارەی دوێنـێ، پیـادەی ئەوڕۆکەیە و لە ژێـر فەرمانی کەسکە و عاسەخاندا بێدەست و دەسەڵاتە. کەسکەی خەسوو و کـۆنە جانتای جادووگەری، فێڵ و تەڵەکەی بۆ سوارەی هەژار ئاواڵە کردەوە و هێزی پیاوەتی پێ هەڵچۆڕاند و تووشی دەیان هەڵە و هەڵخلیسکانی نـاڕەوای کـرد و ماڵی پێ هەڵوەشاند و دۆست و ئاشنا و ناسیاوی لێکردن بە دژ.

سواره سەروسمێڵ سپی و بـێ ڕەنـگ‌وڕوو، تێشـکاو و پەشـیمان، لە نـاو گەروگای خەم و پەژاره و بـێ سـەرەدەریدا سـەری لێشـێوا و ڕۆژی لێبـوو بە شەو.

«ڕۆژێک لە ڕۆژان»

سواره، سواری ئەسپی لاواز و نەشۆراو بوو. باڵتەی ڕەشەڕاوی لە بەر کـرد، چەکی ڕاوی هاویشـتە شـانی، تـاژی ڕەشـەکوژی وەدووخسـت دەسـت لەو و قەوەتیش لە خودای مەزن، بەرەو مێشەزارەکەی کەوتەڕێ.

هەر گەیشتە ناو مێشە و پۆلەپۆڕێکی بۆ ڕێکەوت، تاپرێکی لێ‌تەقاندن سێ پۆڕی پەڕنەخشینی لێگێڕانەوە. سواره بەو ڕێـکەوتە، گەشـە لە هەمـوو گیـانی گەڕا. هەتاوی نەرمەبزەیەکی بێ‌باوی کەوتە سەر لێوە چرچەکانی.

له نێو خەیاڵی خۆشی خۆیدا وردەوردە بەرەو مەزرا و هەوارگەکانی ساڵانی مەرداری دەڕۆیشت. ئەسپەشێ ڕاچەنی و بۆرە کەرویشکێک ڕاپەڕی و تاژی هەر لە حەواوە قۆزتیەوە. سواره دابەزی و کەرویشکی سەربڕی و دەستی حورمەتی بە پشتی تاژییە زەردا هێنا.

سواره موچوڕکەی مەینەتی، گیانی بەردا و لێکدانەوەی خراپ سەری سووک کرد. ئەو ڕۆژەی بەلاوە موبارەک و سەرەتای گۆڕبوونی نەگبەتی بوو. ئارەقەی شادی هەموو لەشی داگیر کرد و لای وابوو شانسی بەرەو گەردوگوڵی بووژانەوەیەوە و نەیدەزانی هەوڵی چارەڕەشی و ئاخری بەهاری سانەوەیەتی. سواره ویستی پشوو بدات لە ئەسپە بۆرە هاتە خوار و لە ناو چیمەنێک پاڵی داوە، ئەسپەکەی لە ناو گیاوگژی خاو و ساوادا چەیار کرد. غەریبەیەک بە ڕێگادا چەقی ملی کێشابوو و ئارەقەی لێدەچۆڕا.

سواره فەرموویەکی غەریبەی کرد و ئەویش بۆ سووکە پشوویەک لای کردەوە و خۆی لێ بەعەرزی دادا.

سەر و قلیان تێکرا و دووکەڵیان لێبڵێندبوو.

سواره: بێ قەیدی بێ لە کوێوە بۆ کوێ و ناوی شەریفت؟

ناوم «سووره»یە و خەڵکی «سەراو»ی سوبحاناغام و لە ئیش و کاری پێویست دەگەڕێم.

سواره: ئیشی چی و لە کامە کار و کاسپیدا دەس‌ودەم‌گەرمی؟

سووره هەناسەیەکی باریک و بۆکرووزی هەڵکێشا و ملی بە لارەوە نـاو دوو دڵۆپ فرمێسکی لێڵی لە چاوەکانی هەڵوەراند: کامە ئیش، کامە هونەر بـوو کە بەسەریدا زاڵ نەبم، ئەی ماڵی بێ بەختی مرێ، هەروەکوو ئاوام بە سەر دێنێ.

سوارە: لەمەڕ کاروباری دیوەخان و چێشت و نان چی؟

سوورە: بەگم ئەوەتی هەم سەروکارم زیاتر بەو خزمەتەوە ئیشاندووە، کاری دیوەخان و خۆراکی ڕازاوە هەر لەمن دەکاڵێتەوە.

سوارە: زۆرباشە کەوابوو شانسـت هـاوردووە. منـیش بە بابـایەکی وەک تـۆ نیازم زۆرە ئەگەر دڵتان بەمن وەکرێت.

سوورە: قوربان قسەت لە دەما شەکر بێت، کە تۆ ڕازی بی، من بێ قسەم.

سـوارە: دەی بـرام زۆر گـوتن قورعـان خۆشــە مـن بڕێـک ئیشـم هەیە و سـەرێک لە مەزرا و لەوەڕگەکـان ئەدەم و ئەگەڕێـمەوە. بەڵام جەنابـت هەر لێرەوە بەرەو گوندەکەمان وەڕێکەوە لەو چەمە پەڕیتەوە ناودێ دیارە خانوومان لەخوار گوندەکە بە تاقەوەیە چنارێکی بەرز دروشمی حەوشەکەمانە.

کەم خێزانم خۆم و خەسووم و عاسەی خێزانم، سێ مۆجزاتین کەم ئەرک و کەم کوێرەوەریم. ئەم سێ پۆڕەش لەگەڵ خۆت بەرەوە بـۆ نیـوەڕۆژە بیـانکە بە کەباب. ئەم کەروێشـکەش بـۆ سەنگەسـیری شـام. دەمـێکە کەبـابی پـۆڕم نەخواردووە، ئەوا سوێم دەبێتەوە بـۆ کەبابێـک تـاژییە سـەقریش ڕسـتەکە بـا لەگەڵ من نەبێ من بەرەو کوێستان دەڕۆم. دەترسـم سـەگ و مەگـی شـوانە مەڕان تووشی سەمڕ و سەمەرێکی بکات. بە فلان بەڵگە خـۆت بە عاسـەخانی کابانم بناسێنە، عاسەخان تۆزێک شێتۆکە و قسەشڕە، دڵت لێی نەبێ. خەڵـووز

و شیشه کەبابەکانی لێوەرگرە بە ئاوری گەش و بێدووکەڵ و چەرچەمان، وێچوویی[1] خۆت نیشان دە تا دەگەڕێمەوە.

سواره ئەمەی گوت و بەرەو لەوەڕگە کەوتە ڕێ. سووره تاژیی ڕستە کرد و کەروێشک و پۆڕی پێچاوە و لاقێکی کردە سێ و بازێکی کردە چوار و بەرەو گوند لە خۆنووسا.

چۆم لێڵە و سوورەش ترسەنۆک. ئەیەوێ تاژییەکەی وەبەستێ و بوار تاقی وەکات. تاژیی لە دار هەرمێیەک شەتەک دا و وەک مراوی بواری بڕی و پەڕیەوە پۆڕ و کەروێشکی لەمبەر دانا و بەرەو تاژی گەڕاوە. تاژی خۆی لە دار هەرمێی پێچاوە و ڕستەی کردۆتە تەناف و لە ملی بۆتە قولفەی مەرگ و ددانی پێ گربوون. سووره دوای شین و شەپۆڕ و بەخۆدادانێکی بەرچاو، هەر بەدارەوە تاژی بەجێهێشت. دووبارە لە چۆم نیشت و بەرەو پۆڕ و کەروێشکە بۆر گەڕاوە. بەڵام گەڕی گەردوون دەستی لەیەخەی ناکاتەوە و هەردەم بەرووداوێکی نوێتر داوی بۆ قەف دەکات. سووره دیتی هەڵۆیەکی حەیتەزەلام لە سەر کەلاکی کەروێشکە بۆرە و خەریکی کەوڵ کردنە. سووره چاوی چوونە تۆقی سەری ڕقوقین، ئەوکی گرت، دەستی بۆ خڕکە بەردێک درێژ کرد، ویستی دەس بووەشێنێ. بەڵام هەڵۆ زووتر کەوتە دەستەوکەری و کەروێشکی خستە حەواو لە هێرشی سووره ڕزگار بوو.

سووره سەر لێشێواو بەناچاری سێ پۆڕەکەی هەڵگرت و بەرەو ناو دێ ڕۆیشت. خۆی بە عاسەخان ناساند. خەڵووز و جێکەباب و شیشەی لێوەرگرت.

---

[1] لێهاتوویی و شارەزایی.

پیـواز و بەهـارە و ئـاولیمۆ و ڕۆنەکەرە و نـانی نەرمـی پێگوشـتنی لە سـەر سینییەکی زێوینە مۆڵ کردن.

هەوەڵ پـۆڕی برژانـد بـۆچەک و چـرکەی تـام و بـۆنی خـۆش نەوسـی ڕاچڵەکانـد، دەسـتی پێـنەگەڕاوە ئەو پـۆڕەی هەر بە دوو سـێ پاروچکـان ڕۆهێشت و نۆشی گیانی کرد. پۆڕی دووهەمی لەشیشـەدا و لە سـەر پۆلـووی گەشاوە جێگەی بۆ کردەوە تا ئاوڕی داوە گورپە پشیلەیەکی ئاماڵ چەتە پۆڕی سێهەمی ڕفاند و هەروەکوو با و بۆران بۆی دەرچوو.

ـسوورە: هەر بە پای پەتی کەوتە سەری و بە خڕکە و پـلار و تاشـەبەردان مەیدانی پێگرت و بەناو هۆدەکەدا وەک شێلاقە دەیسووڕاند. دەستی لە خـڕکە کێشـا و شووشـەی پەنـجەرەی تێکشـکاند و گـورپە پشـیلەش پـۆڕی لەو کەلێنەوە ئاوە دیو کرد. ـسوورە لە بەختی ڕەشی، ڕەشکەیەک ماسیوە لاقـی لە زەوی کوتـا و چەنـد تفـی لە ناوچـاوانی بەخـتەکەی کـرد و فرمێسـکی هەڵوەراندن. بەپەلە بۆلای ئاشپەزخانە گەڕایەوە.

لە مشت و مڕی پشیلە بـۆردا زۆری پێچووبـوو، پۆڕەکەی‌تریشـی لە سـەر ئاگری بەتین، ببوو بە خەڵووز و کەڵکی خواردنی نەمابوو و ئێسک و گۆشت و پێستی بە سەر یەکـا سـووتابوون. چەقە دووکەڵ و بـۆچەک و چەڕەچەمـان، عاسەخانی وەک ماری ژاراوی لە سەر کلکی بۆ پێوەدان ڕاگرتبوو. ئەوەی دەبێ نەکرێ و نەگوترێ گوترا و تف و جنێو و ناو و نیـتکەش سـەربار. لەولاشـەوە سوارە سەرێکی لە لەوەڕگە و جێگەهەوار و ساباتە کۆنەکانی ڕۆژی بەرووتردا و ئاوری بیرەوەری تێهەڵگـرا و فرمێسـکی هەڵـڕژانە سـەر زەوی. زەوی بەیـار و




چارداخی ڕووخاو جێهەواری چۆڵوهۆڵ - چۆڵەچرای هیوای وەبەر با دا و بە هەڵەی ژیانی زانی - کوێرەبرینی کولانەوە، مام وەیسەی مـامی هـاتەوە بیـر و بڵێسەی هەناوی پڕ لە پەشیمانی لە ئەسپی هێنا خوار و ئەژنـۆی پێلەبـاوەش گرت.

پاش ماوەیەک هەناسە و ئاخ و داخ و بەخـۆدادان، شـەیتانی بە نەحـلەت کرد و بە هیوای کەبابی پـۆڕ و ... سەنگەسـیری شـام بەرەو مـاڵ قەمچـی لە ئەسپی لەڕ و لاواز و بێناز کێشا و پێچ و پلۆچی لامووچـانی بە جـێ هێشـت. تەق لە بەردەمی وەتـاغەکەی دابەزی. عاسـەخان ڕووبەڕووی هـات و ڕووداوی سوورەی وەکوو تالاوێک بە زاریدا کرد. هەرچی بەدەمـی داهـات بە سـوورەی بەخێر نەهاتووی گوت.

سواره عەبەسا و ئارەقەی پەژارە پشـووی پێبـڕی و بـوو بە داهـۆڵێکی بـێ مـتەق. نەیـدەزانی لە دەس کـامە بەلا بنـاڵێ، لەگەڵ کـێهە ڕووداو ڕووبەڕوو بوەسـتێ. کارەسـات خـۆکردە و دیـزە بە دەسـتی کابان شـکاوە، چـارە هەر بێدەنگییە. چەند ڕۆژێک تێپەڕی و تازییەی تاژی و کەروێشـک و پـۆڕان تەواو کرا. سواره لە ناو زۆنگی قوڕوقەپی هاتەدەر و ڕوو بە سـووره گـوتی ئەرێ تـۆ هیچ لە جووت و گا و فەلایەتی دەزانی؟

سووره ملی بە لارەوە نـاو گـوتی: گەر بـێ شانسـی دووبـارە دەسـتم لـێ نەوەشـێنی، دەتوانم. بەڵێ، کوڕە جووتیارم، جووت و گا هەر لەمن جـوانە. هەر زەوییەک من گاسنم بیگاتێ، تا حەوت ساڵ بەیار نابێتەوە هەر بەر و بێسـتان

و شــیناوەردێک بە دەســتی مــن بێــتە بەرهەم هەزار ئــافەرین و ماشــەڵڵای لێدەباری.

سوارە زەردەیەکی لێڵ و خەماوی، کەوتە سەر لێوە چرچەکانی گوتی: برام لە چاو و ڕاو و فڕ وفیشاڵان دەس هەڵگرە و لە سەر کردارانی دانــێ. تــۆ چەن ڕۆژ لەمەبەر خۆت بە فەڕاش خاس و ئاشپەز ناساند، ئەوڕۆش بارت لێ‌گۆڕی و بوویە جووتیار و خەرمان پێو.

سوورە: ئاغام تا ئەو هەموو پشیلە برسی و دزانە لە ناو ماڵی تۆدا خەریکــی زیانی و دزی بن من کاری نان و چێشتم بۆ ناکرێت. ئاغام کێ بە دەردی کێ دەزانێ. تۆ نازانی کە دەستم دا کەوڵە نان گورپەی سوور و شڵە و تــاڵە چــۆن پەلارم بۆ دێنن، هەر ئەوندەیە منیش ناخۆن، ئیتر عاسەخانیش سەربار.

سوارە: عاسەخانی چی، بڵێ بزانم دەتەوێ چبڵێی؟

سوورە: هیچ، هیچ، لەزارم هەڵە بوو بمبوورە. ویستم داوێنت بادەم و داوات لێبکەم لە دەس بازبازێن و و میاومیاوی ئەو مۆجزاتانە نەجاتم دەی و ئــابڕووم وەکــڕی. برســین هەر تــێ‌ڕۆدێــن، ڕۆڵەی لە بەر دایــان هەڵــدەگرن، لەوانەیە پیاویش بخۆن، بمکە جووتیار و بەلەخەتــم تەماشــا کە، لە گــامەرز و هۆگــانم بڕوانە، دەست و تووم ببینە.

سوارە: لە خوام دەوێ ئەو کارە بکەی. مەزرام بەیار نەبێ و نەتەوی پێمــان خۆش نەبێ و پلارمان تێ‌نەگرێت. هەر لە ئێستاوە تۆ جووتیاریت.

سوورە سمێڵی لێ‌بــزاوت و بــزەی کەوتە سەر لێــوان. لە خۆشــی جــووت نەجاتی لە دەس قاپ و کەوچــک شــتن و مرومــۆچی عاســەخان. هەر ئێــوارە

تووبەرەتووی داگرت. ملەنیر و ئامووركێش و كەرەسەی پێویستی تێكنا و مشار و تەشوێ و دار و كەڵەوەی زیادی لە دەوری خۆی خڕ كردەوە.

سواره بەڕوویەكی خۆشەوە گوتی: سووره بەڕاستی لە جووتیار دەچی، وێدەچێ سەردەرچوو بی.

سووره شانێكی گەشەی بادا و بەڵێیەكی قەڵەوی بەزاری داهات و پشوویەكی درێژی خواردەوە: گەورەم تا نەكەومە كار، قسە بێ كەڵكە بەو زووانە تێدەگەی جەرگی زەوی چۆن دێتەدەر. بێخەم تۆ بڕۆ بەلای شیرین خەوی شەوەوە، من ئەو شۆكە ناخەوم. ئامرازەكانی جووتیاری لەق و لۆر و لەكاركەوتوون، دەستێكیان تێوەردەدەم؛ هەر پارشێوی ڕۆژووگران بەرەو مەزرا دەڕۆم گایەكان برسین.

ئەبێ تێركرێن. دەنا ئەركی جووتیار دەرنابەن.

سووره ئەو شەوە نەخەوت شەوی مابوو نیر و ئاموور و كەرەسەی پێویستی لە گابۆر و گازەردان هەڵبەست و بەرەو مەزرا وەڕێ كەوت. شەوی مابوو لە داوێنی زەوی باری بە عەرزی دادا. گابۆر و گازەردی كردە ناو لەوەڕگەی خۆشەوە و ویستی تێر بلەوەڕێن و هێزی كاریان بێتەبەرێ و ئەمجار ئەو سەراوسەر هۆگانیان بۆ وەرازێنێ.

سووره لە بەر ویشكە خەیاڵی گامەرز و هۆگانی دوور و درێژ شەو نەخەوتبوو بێخەوی لەشی قورس كردبوو. ویستی تا گابۆر و گازەرد تێر دەخۆن و دێنە كاوێژ و زمان لەخۆ دەدەن ئەویش چاوێك بەخەو گەرم كات. شانێكی بۆدادا و خەویش هێرشی خۆی بردە سەری. بەربەیان نەرم و هەوا

خۆش و زەوی شەدار و دنیاش بێ مـێش و مەگەزە و گەزە خەونـووچکەیەک هەر دەبێ بە زێران بیکرێت.

سووره سەری کردە سەر کلاشەکانی و هەتا هەتـاوی قاوەڵتوونـان چەنەی گەرم نەکرد و مێش و مەگەز و مـۆزە شـینە خوێنیـان لـێ نەهێنـا وەخەبەر نەهات.

سووره بە تینـی هەتـاو و ویزەویـزی مـۆزی ملـۆزم ڕاپەڕی و لەگایەکـانی هەڵڕوانی. گازەردە خۆی لەعەرزی داوە و گابۆرەش بە پێـوە دژ دامـاوە. دیتـی تۆبەرە تۆو خوراوە گازەرد و گابۆر لە پشیلەکان چڵێسـتر لسـکیان داوە. ڕق و قین بەرچاوی سوورەی تاریـک کـرد. ڕۆهـاتە نەقیـزەی خەڵفەبنـاو، هێرشـی بردەسەر گازەردی نووسـتوو زۆر بە قەڵسی دەستی کـرد بەکوتـانی. نەخێـر، نە گازەرد لە بەر کوتەک ڕادەپەڕێ و نەسوورەش بەزەیی پێدادێ.

سووره سەری سوڕماوە، تێگەیشت کە بەهاروو[1] کاری خـۆی کـردووە، زۆر لە مێژە گازەرد عەمری درێژی بۆ جووتیاری بەجێ هێشتووە.

چاوێکی پڕ لە گریانیشـی لە گابۆر کرد، ئەویش ئاوی لە دەمـی دێ وەک ڕەشـکەکا ماسـیوە و وەکـوو مێـژۆکە هەڵـدەلەرزێت، هـا کە ئێسـتا و هـا کە تاوێکیتر ئەویش بە دەردی ئەویتر بچێ و گۆشتەکەی لە کیس بچێت.

سووره نەیکردە نامەردی، سواری سەری بوو، ناوی خودای لێهێنا و سەری بڕی. ئەمجار دەسـتەوئەژنۆ، شـینی تەواوی گێـڕا. سـوارە ناشـتایەکی دڕەنـگ

---

[1] جۆرێک گەنمە لە وەرزی بەهارد دەچێنرێت و کزتر لە گەنمی پاییزەکێڵە و نـانی چـاکی لێ دێت.

سواری ئەسپە شێ بوو و تاپڕەکەی خستە پێشکۆی و بۆ تەماشای گامەرز و دەست و نەقیزەی سووره، بەرەو مەزرا کەوتە رێ. قەمچی لە ئەسپە شێ کێشا و شاباڵی پێ پەیدا کرد. بە چاو لەیەکنانێک خۆی گەیاندە رووداوی چاوەڕوان نەکراو.

سووره ترس لەرزی لێهێنابوو، ئارەقەی خەجاڵەتی سەری شۆڕی ئەوندەیتریش پێ شۆڕ کردبوو. چاوی بۆ هەڵاتنی دەگێڕا و کونە مشکی لێبوو بە قەیسەری. بێسەرەدەری تەنگی پێهەڵچنیبوو. پێی وابوو بەتاوانی خۆی گۆڕەوشار دەدرێ و شارەوشار بەدەر دەکرێت.

سواره سەرەڕای ئەو هەموو رووداوەی کەیەک بەدوو یەکا بەڕووی دادەڕووخان. ژیانیان دەخستە مەترسییەوە، زۆری دڵ بە سووره سووتا و ئاگری بۆ تێبەربوو. زۆری دڵنەوایی کرد و بە روویەکی خۆش و زمانێکی پڕ لە بەخشینەوە گوتی: کوڕم بە خەم دامەکەوە سەر و سمێڵی خۆت مەڕنەوە. تووڕەیی حاسمان و هێرشی بەڵایان بە بەژنی من بڕاوە و نەک تۆ. باشی دەزانم نانی گەنم و باوی هەڕاڵی و خۆلێگۆڕان تیری بۆ خستوومە کەوان هەر تاوێ بە داوێک و بە رووداوێک ڕاوم دەکات و هەرچی بەسەرم دێ و رێگەم پێدەگرێ خۆم بە هەوێنی ئەو بەسەرهاتە دەزانم نەوەک ئەتۆ. ئێستاش کار بەخەمان پێکنایە، وا من بەرەو ماڵ دەڕۆمەوە، یارمەتی دەرت بۆ دەنێرم گایەکان کەوڵ کە و چەرمەکەیان بۆ ماڵ بێنەوە، دەیان فرۆشین.

گۆشتی گابۆریش بە سەر هەژاراندا وەبەشە و ببێتە بەڵاوەگێڕی قورت و بەڵای گەورەتر. هەروەها ڕانێک و بڕێک لە گۆشتی لاشان و مازەپشتەکەشی

بۆ خۆمان ڕابگره. بزانین حاسمان له ڕاستمان چی‌تری پێیه و چ‌گەڕێکی ترمان پێ دەگێڕێ؟

سووره له جوانمێری خاوەن ماڵ تینی تێگەڕا و عەسرێکی زوو، بە کەوڵ و گۆشتەوه گەیشتەوه ماڵ. هەر ئەو شەوه سووره بە کەیفی خۆی ورگی له کەبابی گابور هەڵێنجا و پشیله و گورپەی بزۆز و هاروهاجیشی پێ حەمایەت کردن.

سواره دەستووری دا هەر بەیانی ئەو دوو کەوڵە گایه بەره بۆ شار و له چەقەی بازاڕ بیانفرۆشه، پارەکەیان وەگێڕە بۆمن و پێویستم بەپاره زۆره.

سووره هەر له تاریک‌وڕوونی بەیانیدا خۆی گەیانده شار و له ناوەڕاستی چەقه بازاڕەکەدا هەی چەرم هەی چەرمی گرتەوه. قوڵه چەرچی و دەست و گوێبڕ تێی‌گەیشتن. یارۆی کەوڵ فرۆش لێنەزان و فشەڵۆک و له دەستان نەرمه. بڕیاریان دا هەموو له هەموو ببنه شەریک و مفت و مەرحەبا ئەو چەرمه باشانەی لێوەرگرن. جووتی چەرمەگا بە ٣٠ دینار هەر تووڕەی بوو. ئەوان وەک چاو بەست بە چوار دینار و نیو لێیان کڕی. تاق و جووت له ترسی تەشقەڵە و پەشیمانی سووره خۆیان له ناو ئاپۆرەی خەڵکدا گوم کرد. سووره پارەی له گیرفان ئاخنی و ویستی بەرەو ماڵ وەگەڕێت و چالاکی خۆی نیشان بدات. بەڵام قەرەباڵغێک دەوری چەقەبازاڕەکەی وا تەنی بوو کێچ نەیدەتوانی ڕاپەڕێت. پێ‌لەسەرپێ خەڵک ڕاوەستابوو بۆ تەماشا و چاوەچاو و پاڵەپەستە و کەس‌لەکەس بوو. سووره بۆ تەماشا خۆی بەنێو ئاپۆرەدا کرد و دیتی کابرایەکی چاوشینی ئاولاوی مەلێکی بورکەڵەی پێیه و هەروەکوو

مەیموون گاڵتەی پێدەکا و هەر نۆبەی بەڕەنگێک و مەکرێک مەلەکە خۆی دەگۆڕێ و یاری دەکات. کابرا دەیەوێ بیفرۆشێ بەڵام نە بۆخوی ناوی دەزانێ و نە خەڵکی بازاڕەکە دەیناسن. تەنانەت ڕاوچیەکانی ئەو مەڵبەندەش دەیان گوت تا ئێستا باڵندەی ئاوامان نەدیوە.

ئەو دەعبا بۆرکەڵە لە کۆترۆکێک باوخۆشتر بوو ئەگەر کابرای خاوەنی قەڵسی دەکرد، دەکەوتە هوومەن و شالاو و هەموو لەشی دەبوو بە گەردن و دەهاتە سەر وێنەی شینەمارێکی پڵپڵی گاهەنگێو. ئەگەر لە هەڵبەزین و شالاو و زەنازەنا ماندوو دەبوو خۆی دەبردەوە بەریەک و دەبوو بە کوندە چکۆلەیەکی سەر کەڵەکان.

جاروبارەش دەم دەکاتەوە و دەچریکێنی. چریکەی لە سەقر و بازان نامێنێتەوە. پەلەوەر ناسەکان نەیان دەناسی بە سەر سوڕمانەوە هەریەکەی ناوێکی بەسەردا دەبڕی. یەکێ لای‌وابوو زڕەشاهۆیە، ئەوی‌تر ئەیگوت، ڕەنگە ڕەش‌بەشۆکە بێ و بڕێکی‌تر دەیان گوت ئەگەر هی‌هی کەرە هەبێ لە سەر زەوی هەر ئەوەیە. کابرای واهەبوو بە سوێندانەوە دەنووسا و دەیگوت کەومارە. زۆر کەسیش لای وابوو شوان هەڵخەڵەتێنەی فیلەبازە.

سووره دەمی بردە پێش و وتی من ئاغاکەم ڕاوچی و پەلەوەرناس و سەردەرچووە. هەر دەبێ ئەو بیناسێ. بیسمیللا، شەقەی سەودامان بێت.

سووره بە سێ‌دینار و دوو درهەمان دەعبای کڕی و بەرەو ماڵ پێی پێوەنا و دەعبای لەبەر دەمی ئاغای دانا.

سواره: ماڵوێران ئەم کونده چکۆلەت بۆچی هێناوه ئەمه قەشکه و نان و دۆبرە، مەیمەنەتی باش نییه، زووتر بیبەوه جێگاکەی خۆی گوناحه بێزمانه با خوامان لێ نەڕەنجێ.

سووره: بەسەری تۆ نه کونده و نه نان و دۆبڕ مەلێکی قوماربـاز و خۆش ئاوازه، له دەرکی هیچ پاشازادان وەدەس ناکەوێ، له ناو مشتەری چەقەبـازاڕی شارا کڕیومه ڕفاندوومه. باوەڕ دەکەی بـۆ خەمڕەوێنی هەر وەگیـر نـاکەوێ و هیچ سەیر و تەماشایەک دەسکی لەدوو ناکات. ئەو دەعبایه وەدەس هیچ میـر و خانان ناکەوێت. له سەر ڕوخسەتی تۆ با برێکی لەگەڵ بـدوێم و بەزمێکی وەڕازێنم.

سواره: فەرموو بزانم ئەم دەعبا بۆر و دزێوه چی له دەس دێت.

سووره ڕۆیشته پێش و پەڕێکی سەربالی کێشا و بـووزێکی پێوەکرد و کێشەی پێ هەڵاییسان. دەعبا ملی کێشا و گووپی ماساند و پـڕ به هـۆدەکه زریکاندی. چەتـری هەڵـدا و پەڕی زێـڕین و هەزار ڕەنـگەی خسـته بەرچـاو جاروبـارەش دەبـوو به مـارێکی ڕێکوپێـک و ڕازاوه. دەعبـا شـانۆیەکی وای ڕازاندەوه، سواره و عاسەخانی خسته قاقا کێشان.

عاسەخان: ڕەبی دەستت خۆش بێ سـووره، تاوێـک سـەیری ئەم دەعبـایه بۆرەبۆری سەد گابۆر و گازەرد دێنێ، هەر دەبێ ئافەرینت لێبکرێت.

سواره: تا ئێستا موتولفەی وا جوان و لەبەردڵانم نەدیبـوو. شـاخ و ڕەوەز و چۆڵگان زۆر گەڕاوم ماڵە بەگ و میـران زۆر چـووم، هێشـتا مەلـی وا زیـت و

زرینـگ و گـاڵته چـیم چـاو پێنەکەوتـووە. ئەی خـۆزگە مێیەکەشـی وەدەس دەکەوت، ئەمجا جووجەڵەشیان ئەبوو بە جێگر و لەبڕانەوە نەدەهاتن.

ئێستا ئەمە تەنیایە داخـوا چەنـدیتر بـژی و ئیتـر هـیچ. هەر خەفەتمـان پێدەبڕێ و پەکووپەکوو.

سووره: بەگم تۆ سلامەت بی ئەویش پەیدا دەکەم هیچ خەمت نەبێ.

سواره: لە منت کەوێ بەهەر قیمەت بێ لێی ڕامەوەستە. ئەگەر سەر زەوی هەموو گەڕابی ئەبێ پەیدای کەی. زۆر منەتی هەیە.

بەڕاستی خوا ڕاسـتی وەڕێ هێنـاوی چەرمـی گـازەرد و گابۆرانـت لە ئـاو نەکردووە، ئەو دەعبایە هەتا بڵێی جوان و مـایەدارە. خـاوەنی نەیناسـیوە دەنـا ئەوە فرۆشی نییە مەلێکی پەڕزێڕین و قەدەمخێر و خەمڕەوێنە. دەبێ ناویشـی هەر خەمڕەوێن بێ.

ئەتـۆ هەرجـۆر بـێ ئەبـێ مێوەکەشـی بەدەس بێنـی. ئەگەر ئەو کـارەت بەدەستەوە بێ ناوت ئەنێم سوورەی ڕووسوور. سوورەی لێهاتوو.

سووره: ئاغام دڵـت تەخـت بـێ، ئەگەر لە کێـوی قـافیش بـێ لە دەسـتم دەرناچێ. یان سەرم دەدۆڕێنم یان تایەکەی پەیدا دەکەم.

سووره نانی کەوتە ڕۆنەوە. خەمـرەوێن لە شـینە و چیـنە و خـواردەمەنی خۆشدا هێز و توانای هاتەوەبەرێ و پەڕوپۆی زێڕینتربـوون. لە هەمـوو شـار و شارۆکە و گوندان دۆست و ئاشنا بۆ تەماشای خەمـرەوێن بەرەو مـاڵی سـواره دادەبارین. مـاڵی سـواره لەبەر هامۆشـۆی پیـادە و سـواران ببـوو بە مـۆڵگەی مەڕێک و قاڵمەقاڵمی بێتام و خوێ. سـواره ڕۆژێـک لە ڕۆژان لەبـن هەرەسـی

خەیاڵی تاڵی قەرز و قوڵەی ناقولاّدا بە دووچاوان فرمێسکی دەڕشت، بە دوو دەستان نەژنۆی خۆی ڕادەژاند و بەسەری زمانی لە دەس خولی زەمان و شانسی لاواز ئەوی نەدەبوو بگوترێ دەیگوت.

ویستی بە تەماشای خەمرەوێن بەزمی بتارێنێ و خەمی بەبادادا خەمرەوێنی هێنا و بوزێکی پێوەکرد و پەرێکی کێشا. خەمرەوێن خۆی گرژ کرد و چەتری لێدا و بە زمانێکی پڕ لە شالاّو و مەترسی چریکاندی. سوارە سەری نەوی کرد و ویستی بە دەمی پڕ لە خۆشەویستی لە خۆشەویستی خەمرەوێن زیاتر بڕواتە پێش و هەر دوو لاچاوی خەمرەوێن ماچ بکات. خەمرەوێن لای وابوو خراپەی لەگەڵ دەکرێ و قووت دەدرێت . کەوتە شەڕ و شالاّوی هێنا و دندووکێکی لە چاوی سوارەدا بردە خوار و گلێنەی لە گرێژنە برد و بۆی دەرچوو.

باشتر بڵێم سوارەی بێ چاو کرد و لە شەقەی باڵیدا و لە چاوان خۆی گوم کرد. پاش ئێرە و ئەوێ و داوودەرمان و ودمی چاک و پیران چاو بە قەل پووچی ماوە و سوارەی بەناوبانگی جاران، ناونرا سوارە قەلپووچ.

ساڵ هات و ساڵ ڕۆیشتن. نەگبەتی شان و ملی سوارە قەلپووچی بەرنەدا و هەر جارێ لە بارێکەوە بەلاّ قورسایی دەخستە سەرشانی. تا ئەو جێگایەی کە لە عاسەخانی خێزانیشی کەوتە شک و گومان و دڵپیسییەوە، ئەو گومانەش ئاگری لە هەناوی بەردەدا و سەری پێ لە قالان دەنا و لە زەنازەنای خەیاڵی تاڵدا هەروەکوو مس و مسینە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر دەتوایەوە. ڕۆژێک ویستی بۆ سەفەر بڕوات و شەو نەیدەتوانی وەگەڕێت. بانگی سوورەی کرد و

لای خوی بەسرتە برێک نهێنیی لا درکاند و گوتی من دەچم بۆ سەفەر شەو لەبن درگا وریابە. ئەوەش قفلّ ئەوەش کلیل، هەرکەس لە دەرکی دا و نەلّێ سوارەی سەفەریم، هەقی کردنەوەی درگات نەبێ.

سووره: بەلّێ ئاغام ئەمری تۆ لە سەر سەرمە، هەر لە ئێستاوە تەورە زەردەم دەسووم و هەر کەس بەلای دەرکی تۆدا بە خەیانەت ڕابرێ بەو تەورە دارشکێنە تێکی دەشکێنم.

سواره: ئافەریم بەڕاستی ئەمین و گوێلەمستی بەلاّم تۆش هەر وەک خۆم کەم شانس و بەخت گێژی. ڕەنگە من هەر لە شەودا وەگەڕێم هەر وەخت لە دەرکمدا و گوتم سوارەی سەفەریم گورج دەرگام لێهەلّگرە.

سووره: بەلّێ قوربان حالّیم، تۆ خوات لەگەلّ و من و دەرگا و تەورەزەرد.

سواره ڕۆژی دواتر سوار بوو ڕۆیشت. سووره هەر نیوەڕۆ جێگاوبانی خۆی بردە سەرسەکۆی بن دەروازە و دەستی بەتەور سوون کرد. لەبەر خۆیەوە هەر وڕینەی بوو. دەیگوت: هەرکەس نەلّێ سوارەی سەفەریم نەدەرکی بۆ دەکەمەوە و نە جوابی دەدەمەوە.

عاسەخان تێگەیشت ئەو جۆگەلە لە بناوانیەوە چۆن هەلّگیراوە.

عاسەخان: سووره هەر ورتە ورتە ئەلّیی چی؟ ئەم تەورە بۆچی ئەسووی.

سووره: خانم تۆ کارت نەبێ بۆچی ئەسووم و چیم پێگوتراوە.

عاسەخان بە قەشمەرییەوە بە دەوریدا هات و کیسەی بۆ پڕ لە تووتن کرد. ڕەمزی شەوی هەستاند و لە ڕووداو و سەفەری سواره حالّی بوو. عاسەخان خۆشەویستی خۆی لە ڕەمزی شەو گەیاند و کەیفی شەوی

تەدارەک گرت. شەو داهات و سووره دەرکی قفڵ کرد و تەوره زەردی لە سەر کۆشی دانا و حکوومەت نیزامی ڕاگەیاند. لە چەقی بێلایە چوار مێردەکی دانیشت. شەو تاریکایی تێگەڕا و بە هێواشی لە درگایاندا. سووره زۆر بە تووڕەیی گوتی کێ بوو. دەنگێکی نەرم گوتی سوارەی سەفەریم.

سووره: فەرموو بەگم. خێر بێ زوو گەڕایەوە. کابرا لە ژێر لچەوە گوتی واهات. ڕۆیشتە ژوور. دوو چەتۆری پوول خستە کۆشی. گوتی سووره هەر کەس لە دەرکیدا و گوتی سوارەی سەفەریم هەروا بزانە دزە و درگای لێهەڵمەگره.

سووره: ئەمر فەرموو قوربان فەرمانی تۆ بەڕێوە براوە.

سواره هەر ئەو شەوە بەرەو ماڵ گەڕاوە کەڵەباب خوێنی پارشێوان لە دەرکی خۆیانی دا. سووره گوتی کێیە. گوتی: سوارەی سەفەریم.

سووره: تۆ دزیت فریوم نادەیت سوارەی سەفەری هەر نوێژی خەوتن گەڕاوەتەوە و لە ناو جێوبانی خۆیدا خەوتووە.

سواره لە هەنگامە تێگەیشت. گوتی بیکەوە ڕۆژەڕەش من سوارەی سەفەری ڕاستیم ئەوی‌تر دزبووە.

سووره: فریوم نادەی تۆ دزی غەریبەی زیاتر لە سەری بڕۆی بەو تەوره تازە دەمە زەردە جوابت ئەدرێتەوە.

سواره: من سوارەم سوارەی سەفەری حەسلم، ئەوەی چۆتە ژوور فێڵی لێکردووی ئەو دزە نەک من. من سوارەی ئاغاتم دەرگا هەڵگرە و لێم بڕوانە. بزانە خەمرەوێنی تۆ چاوی ڕاستەمی چۆن هەڵکۆڵیوە. بزانە بەچەرمی گازەرد و

گابۆران چ بەڵایەکت بۆ کریم. دەرگا وەکە و وەمناسە. ئەگەر بۆ خۆت نەتگوت ئۆباڵ بە ئەستۆم هەوی تەورە زەردم لێ خوێناوی کە.

سووره دەرگای لێکردەوە و زۆری تێهەڵڕوانی گوتی: بەڕاستی خۆتی ئۆباڵ بە ئەستۆم ئەوی‌تر فێڵی لێکردووم، خۆت نەبووی. تۆ خۆتی نەکابرای هەوەڵی شەو. ڕوخسەتم‌دە بابڕۆم تەورێکی لێ‌تاقی وەکەم بۆ باپیرەی بکەمە قوربانی.

سواره چەق‌وچۆی ڕوودا و هەڵی دەچۆقاند. تسۆ مەڕۆ خۆم دەچم بەو خەنجەرە شاڵاوی دەبەمە سەر. ئەگەر دەرۆستی نەهاتم تۆ لێرە چیت لە دەس هات بیکە. قارەمانی لە تۆ و ئەنعام و خەڵاتیش لەمن.

سووره: ئاغام بێ‌خەم بە و تەوری من گورچووی پۆڵا دەبڕێت.

سواره بەرەو هۆدەی عاسەخان ڕۆیشت دەرکا قفڵ بوو تا دەرگای شکاند کابرای دز لە پەنجەرەوە فڕکەی بۆ کرد. دەستەوخەنجەر بەرەو دەرگای حەوشە کەوتە سەری دەنگی سوورەیدا و سووره تەوری هەڵسووڕاند. ساحەب ماڵ وەبەر هات و دز ڕای کرد. تەور کاری خۆی کرد و سەری سوارەی پلیشاند. سووره دەستی بە لەخۆدان کرد و باوکەڕۆی گەیاندە کووچە و کۆڵان. عاسەخان و کەسکە کاری خۆیان کرد. شان و باڵی سوورەیان شەتەکدا و هەروەکوو قاتلێک ناساندیان. کارەسات بە قازانجی دز و مەرگی خاوەن ماڵ تەواو کرا. میرەماڵ کوێرەوەبوو. هەڕاڵی سامانی سوارەی هەڕاج کرد و سەری وەبەر تەوری نەزانان دا و بۆ هەتاهەتایە ناوی لە ناو مێژوودا کردە مەتەڵۆکە.

# پۆڕ و هەڵۆ[1]

پێشەکی پۆڕ و هەڵۆ

بەرەبەیانە و سوێگەکان بەرەبەرە بڕەیان تێدەگەڕێ. پەنجەی زێوینی سروشت دەیەوێ پەردەی ڕەشی شەوەزەنگ بدڕێنێ. ئەستێرەگەشەی بەرەبەیان لە سەر ئەستۆی بەرەزایان ئەستی وەدەر دەخا و بە مەرگی شەوگاران پێدەکەنێ. شەوپەڕی خاسەکەو و فرەی پۆڕان کۆچی شەو بەڕێ دەکەن و خەواڵووان ڕادەپەڕێنن. بە هەوای نەرمی بەربەیان گوڵان خۆ لێک دەدەن و بەرۆکان دەترازێنن، دڵان دەخرۆشێنن.

پەپوولەی باڵ زێڕین بەرەو بەهەشتی گوڵزاران بەباڵ دەکەوێ و لە سەر ڕوومەتی خۆنچەدەمان بەرووادا دێن. شەوبای شەوی لاموچان هێدی هێدی بەرەو لێرەوار و کەپرۆکەی پۆشین بەڕێ دەکەوێ و بسک و کەزیان دەبزێوێ و بەرۆکان دەکاتەوە و ئەوینیان تێدەڕژێنێ. خاسەکابان و شێرەژنی داوێن پاک دەستان لە سەر ئەستۆی خۆشەویستان لادەبەن و لیباسی نازی شەو فڕێ دەدەن و هەڵکێشی گورجی ڕۆژانی هەڵسووران هەڵدەکێشن و ئارام ئارام بەرەو کانی زوڵاڵ و ئەستێری ڕاوەستاو وەڕێ دەکەون.

دەست و ڕوومەتان دەشۆن و پەرچەمان دادێنن. دەس نوێژان دەگرن و لە سەر تاتە بەردان دەپارێنەوە و سەری بەندەیی بۆ خودای بەندەنەواز، بەرەو

---

[1] ئەم چیرۆکە لە سروەی ژمارە ١٨٠دا بڵاو کراوەتەوە، بەڵام پێشەکی لەگەڵ نەبوو. لە دواییدا وەدەس کەوتووە و وەسەری خراوە.

زەوی نەوی دەکەن. چادانـان لە چـاوگەی زوڵاڵ پـڕ دەکەن و بە تەڕدەسـتی بەرەو تاوڵ و کەپران دەگەڕێنەوە.

گــڕی بەرانەی ئەســتۆی گــاگێران دەکەنەوە و بەرەو لەوەڕگە و بژوێنــان بەڕێیان دەکەن. دەیانەوێ تەدارەکی ڕۆژی نوێ، نوێتر بگرن و مزڵ و قۆناغان بە ئەوین داڕێژن. بەرەبەیان خـڕەکە دەبـێ و پێدەگـرێ و زیـاتر پێدەکەنـێ کێوەکان عەبای ڕەشی داوێن پیسـی فـڕێ دەدەن و کـڵاوی زێـڕین لە سـەر دەنێن. دیمەنی سروشت بایباڵی خۆی دەدا و خۆی دەنوێنێ. هەمـوو دڵێـک وەکوو دڵێک دەبنە دڵداری هەتاو و هەمـوو چـاو وەکـوو چاوێـک بەرەو چیـا هەڵـــدەبڕێن، لە شـــاخ و کەڵەک و زەرد و بەردان دەڕوانـــن و لە ڕووداوان دەترسن.

کێو و کەژ هەرچەن شین و گەش و بە دیـمەن و دڵـڕفێنن بەڵام چڕۆژان بەبێ ڕووداوی تـاڵ و چەق و تەفـی پـڕ لە ئـازار سـەرنانێنەوە و کەم و زۆر زۆربەی ڕۆژان دەسـتی پەلامـار و دەوەنە ئاشـی لێدەوەشـێت. ئەو ڕۆکەش هەروەک ڕۆژانـی بەرووتـر کرێـوەی پەرپـۆیەک رایەڵ و پـۆی کرێکـار و دەشتەوانان دەشەمزێنێ و سەرنجیان بەرەو مەرگی گیان لەبەرێک ڕادەکێشێ. پەروپـۆی پەرێکـی پەرزێـرین پـۆرێکی ئەسـیر لە ژێـر چرنـووکی هەڵـۆیەکی خوێنڕێژ و بێ بەزەییدا بە بادەبێ و هەڵدەوەرێ و ماڵاوایی لە ژین دەخوازێ.

«پۆڕ و هەڵۆ»

پۆڕ باڵدارێکی بە باڵ و داو و دەلینگ زێڕینە، بە لەنجەولار و خوێن‌شیرینە خان و مان و پەڕنەخشینە، گەردن‌کێل و دەنووک گرد و چەتر هەنگێوە، خەڵکی مێشەلان و جێگای زەمەنەد و چوغورە، لەخۆ شارۆکێنەدا کەم وێنەیە، بە ڕەشەڕاو بۆ ڕاوچی ڕەداو ناکەوێت، مەگەر لە کەوی و کلکەدەراوان سێپەی بۆ هەڵبەستی دەنا پێی ناوەستی. پۆڕ جوانترین مەلی بێشەزار، بێزەڕ و گەڕ و ئازارە، گۆشتی پشتی بەتام و چێژە، مێشکی، کۆڵ و گێژە. لە ڕۆژانی هەور و هەڵاو و بە سێبەردا زۆر بە کەمی وەبەر چاو دێت. بەڵام، لە ڕۆژانی ساو و هەتاو، بۆ زۆربەی چاوان بەرچاوە، هەر بۆیەشە، هۆزی پۆڕان، لەترسی ڕاوکەری مەحاڵ، لەگەڵ هەتاو نابنە هاوسێ، نابنە هاومال. لە جێ‌هەتاوان ناگەڕێن، لە سێبەرگایان دەنیشن، دەلەوەڕێن.

ڕۆژێکی بەژان:

ڕۆژێک لە ڕۆژانی بەژان، پۆرێکی جوان، ڕێک و پێک و بەباڵ و باو، هەوای کوێستان لە سەری دا، بە داو و ناو، لە قیرەی بۆقان وەڕەز بوو، قیژەی قەلی پێ ناحەز بوو، فڕی لە مێشان هاتە دەر، ئۆغر خێر بێ بەرەو سەفەر. بەرەو چیای بەخێر و بێر، هۆبە و هەواری ژین و مێر. ڕووخۆش، دڵخۆش. بەڕەنگ و ڕوو، فریە سەر کەنک و شاخان، هەڵوەرێنێ دەرد و داخان، خۆیدا بەر ئاوێنەی هەتاو، خۆی پێ جوان بوو، بێ چاووڕاو، هێند بە جوانی لە خۆی ڕوانی، چاو هەنگاوتی، شەقژنێ لە پڕ بزاوتی. چاوەزار بوو، بۆی ڕێکەوت، تیری نەدیدەی وێکەوت، لەخم خۆرکی مەرگ کەوت، بوو بە نەچیری، ڕاوچی پیر، شا هەڵۆی تەلان و مەلگیر. هەڵۆ بردی وای داهاتێ، دەستی نەجاتی نەگاتێ.

پۆڕ و پەلەقاژەی نەجات:

پەری پۆپەزێڕینی هۆزی پۆڕان هاتە دۆڕان، کەوتە پاڕانەوان بە زمانێکی نیوە زمان، وتی لالە هەڵۆ ئەمان، من پۆڕێکی ناو شێوەردم مەلەکەی زێڕینی هەردم. هاوسێیەکی منالّ وردم، نەرم و شلێکی کەم خوێنم شێخی دەم ئاو و بەستێنم، پاک داوێنم، بۆ عەمری درێژت خێرە، لە خواردنم خۆ ببوێرە، لێم گەڕێ با وەگەڕێم، فرێکیتریش هەڵفڕم تا منالّم پێدەگرن، خڕەکە دەبن لە بن پەرچان دێنە دەر و پێ دەگرن و فێر دەبن، دەبن بە پۆڕ و خۆ بەخێو دەکەن.

میرم، ئەی بەرزەفڕ، میر بە بێ ئازار بە، لە ئازار و بازای بێهێزان شکێ بکە، ئەی لالە هەڵۆ، ئەی پەرکووڕ، ئەی بە وتەی نووسەران ڕووسوور. ئەو هەلەش دواقانم دە. با وەگەڕێم، با لە گەڕ و گزەی برێک نووسەری نانی نانیدا سەردانەنێم. ئەی لالە هەڵۆ، نووسەران منیان هێنا سەران و سەریان پێدانام. نووسەران، ئەتۆیان بە جیهانی خاسناسان، کردیانی بە میر و هاتیە ناو باسان، هوڕای شەڕەفیان بۆ کێشای، ڕەنگی فریشتەیان لێدای. بە شێعری خوڕ چاویان شردی، ئاوزەنگیان بۆ داگرتی، عەبای غەوسیان لە بەر کردی، لە سەرووی هەوران جێیان کردی. مێزەری شەڕەفیان، لە سەر دانای، هەوتا کرای، ڕەگەڵ خاسان خرای، بوویە خۆشنیو، بوویە میری تەلان و کێو، قەلیان گول کرد، تۆیان زل کرد، وەها بەتام بۆنیان کردی، سرک و سڵیان بۆ ڕام کردی، دەیان مەلی ساویلکەی من ئاسایی، بە هیوای بەرزایی نزماییان

جێهێشت، سزای نەزانیمان چێشت، بە وتەی نووسەری بێچێژ، بووینە گێژ. بووینە میوانی شای خوێنڕێژ، کێ بەرەو زاڵم و زاڵی ڕابوو، کەوڵ و پێستیشی وەها بەربا بوو، با نەزانێ بەرەو کوێ چوو، وەک چووان، لاچووە، هەرچوو، هەر چوو، تۆ بڵێی دووکەڵی ئاراوبازام، مەرگ، زارۆکی لەڕوو، ناتاکام. ڕیشی کام نووسەرێ، بسووتێنێ؟ تا لەمەولاوە، بە دەستی زاڵ چی دی نەڕژێ، لەچیا خوێنی ئاڵ.

پیرە هەڵۆ:

شا هەڵۆی هەڵەت و چڕ، کۆنە ڕاوچی بە چنگ و دڕ، هەستری دەمی پیسی، قاقای کێشا، خوڕی وەڕی، وتی ئەی نەرموڵە، ئەی خۆشترین بابۆڵە، تۆی ساویلکە بیرت شاشە، کە ماوی، تێبگەی باشە. بۆ بەرەی ئێمەی پاشا، گزیر، دارۆخە بەڕێزن، بۆمە باڵن، گیانی هێزن، قەشە و مالیش بە کەڵکن، سەرەی خەڵکن، شێخ و خەلیفە زەروورن، بۆ زاڵمان، مەکۆی نوورن، جێباوەڕی هەر سنوورن. پاشای بێ نووسەر مەحاڵە، ئەگەر هەشبێ ژینی تاڵە، شاعیر تێر کە و دوژمن کوێر کە، بۆ شێخ تەلارێ هەڵبەستە، چاوی هەژاری پێ بەستە، بۆ نووسەران پووڵ هەڵڕێژە، هیچ مەبێژە، لە هەرلا ڕاوت بۆ دەکەن، خاوەن خێر و ناوت دەکەن، ئەوانە پێمان هەڵنەڵێن، بۆمان نەڵێن، هەڵەمان بۆ دانەپۆشن، شیری گەشمان بۆ نەدۆشن، بە شێعری گەش نەماندێرن ساویلکانمان بۆ نەنێرن، ئێمە داوەڵی بێ باوین، گێلین، خاوین، چووکین، پووکین، بەجێماوین، بێگوڕ و گەڕ و بێڕاوین، زۆر پێناچێ شەندە




و مەندە تێدەکۆشن، بەزمان، بە بەلاش، دەفرۆشن. ئەی پۆڕۆکەی گۆشـتنۆکە، ڕێ لێ گۆڕاو، خوێن لێ چۆڕاو، چڕاو، بە تەنێ ناکرێن، بێ خێڵ پۆڕۆکە ناخورێن، لە سەر ئەو زەوینِە جوانە، کێت پێ چووکە کێت پێ خانە، تا نووسـەران پێـی هەڵنەڵێن، شاعیران شێعری بۆ نەڵێن، شێخ و مـالم، گەورەی نەکەن درۆی بە دەورەی بۆ نەکەن، نابێتە خان نابێتە میر، نابێتە شا هەڵۆی مەلگیر.

# بەسەرهاتی خولە و پیزە

پێشەکی:

لە زەمانی بەرووتردا، نە هێشتا کە لە زووتردا، ژیان ئاوا بە ژان نەبوو، خەڵکی ئەودەم بزان نەبوو، دەمار هێندە فرێ نەبوو، خانوو گشتی قورینە بوو، تەنوور و کورسی باوی بوو، حەسیر و کەرکە ناوی بوو، گاڵ و هەرزن کەم و زۆری، ترخێنە ببووە پێخۆری، دۆکەشک و دۆیێ کە هەبا، دەبوو بێژی سەد مەرحەبا، بەو حاڵەش خەڵکی برا بوون، لە دەور یەک وەک چرا بوون، بێ‌فێل و فووت و هەڵە بوون، وەک بێستانی بێ‌کەڵە بوون، لە مزگەوت و لە دیوانان، بۆخۆ یا نە بۆ میوانان، شەوچەلەی شەو دەرمانێ خەو بۆ ئەم، بۆ ئەو، نەزیلە و قام و بەستە بوون، هۆرە و لۆرەی بە بەستە بوون، گەرەلاوژ هەر جۆرە بوو، بە نۆرە بوو، مەجریس بێ‌سۆرە و تۆرە بوو، زۆر هەبوون لە پیرەپیاوان، لە نەناس و لە ناسراوان، زانا و پسپۆڕ و بەهۆش بوون، دەم و دەراو تەڕ و خۆش بوون، بۆ داستانان دانەدەمان، زوربەی شەوان زۆربەی دەمان، لەبەر ئاور و گوێ‌تەندووران، لە سوێ بان و دەر و ژووران، حیکایەتیان دادەبەستن، بەستە و بەندیان هەڵدەبەستن، لە مەجریساندا دیار بوون، زۆر مەند و ماقووڵ‌گوفتار بوون، ناویان نرابوو شوعەرا، بۆ شەوی ڕەش وەک چۆڵەچرا، خەڵکیان لە دەورە دەهاڵا، زل و زرتە و کورتەباڵا، تا شەوگاریان پێ‌ڕادەبرد، مات و بێ‌دەنگ گوێیان دەگرت، مام سابیرێک لەو نێوە بوو، بۆ داستان و حیکایەتان، بۆ

هەڵبەست و بەیت و باوان، بۆ شەڕەفڕ بۆ لاتاوان، بۆ فیشاڵ و چاووڕاوان کرێوە بوو، شۆعەرای ئەو نێوە نێوە بوو، ئای چ زانا و هەنگێوە بوو. لە جانی بنی جانەوە، جندۆکەی وا بە پانەوە، نەبینرابوو لە مەڵبەندان، وەک ئەو بێژێ قام و بەندان، چی گوتبایە نەیدەگوتەوە، دەنگی دەتگوت قاقای کەوە، چۆنی دەنووسم وای دەگوت، مام سابیر باشقە شۆعەرا بوو، بە ڕەحمەت بێ شوعەرای چا بوو، دەیگوت چەند ساڵێ لەمەوبەر، منالێ بووم بێ‌کەس، بێ‌دەر، شوانە گاگەلی مامەم بوو، منال، تەنیا و بێ‌هاودەم بووم، هەچەند زۆر تێر و پڕ نەبووم، مەچەک‌ئەستوور، بە گوڕ نەبووم، بەڵام قۆشمە و ژیکەڵە بووم، کورتەبالا، خرکەڵە بووم، دەنگ‌خۆش و ڕەزاشیرین بووم، ئەودەم لە ناو ژانی ژین بووم. بەڵام خاوەن دەم و ژیر بووم، سابیر بووم نەک مام‌سابیر بووم.

زمانی هێن پاراو بوو، چی تیتاڵ و بەیت و باو بوو، لەوڕابوو بۆمان بەجێما، لەو مەمنوونە بەرەی ئێمە، لەوڕا یەکێ بەیت‌بێژە، خۆش‌بێژە یا حۆل و گێژە. سەد ڕەحمەت بڕژێتە گۆڕی، بەزەی خوا بێ چاوەنۆڕی.

بەسەرهاتی خولە و پیزە[1]

شەوێک بە شەوی زستانێ. لە گوندی کۆنە لاجانێ، لە ماڵێکی تەڕ و بڕدا، لە هەیوانێکی قاقڕدا، چۆڵەچرا فتیلە بوو، تەپاڵە دەستەچیلە بوو، ڕاخەر حەسیری کوردی بوو، گرێچن ڕەق وەک بەردی بوو، مام سابیرمان بە

---

[1] ئەم چیرۆکە هی مامۆستا ڕاوچی‌یە لە لایەن نەوەیەکی مامۆستاوە بە نێوی عەزیزی عەزیزنژاد بۆ گۆڤاری سروە ناردراوە و لە سروەی ١٥٧دا بلاو کراوەتەوە.

گیرهانی، دەورەمان دا تا بەیانی، ئەو شەو هەتا هەموو نوستین، بەیت و بـاوی بۆ رێک خستین. بەیتی خوله و پیزه شێتی، خەڵکی ئـاوایی «شـەروێتی، وای گێراوه ئەو رووداوه، هەر دەڵێی ئەورۆ رووی داوه، خوله و پیزه ئاواره بـوون، له شەروێتی شوان‌کاره بوون، پەنابەر و کارەکەر بـوون، ژن و مێردێکـی هاوسـەر بوون، خوله شوان بوو پیزه کابان، له دەس پیزه ئامان ئامان، خـوله هێـدی و لەسەرخۆ بوو، پیزه بۆ شەڕ وەک هەڵۆ بوو، خوله ئاماڵ کەیخوا بوو، هەر جـۆر بڵێی باشه، وابـوو، سـەرناس و گۆچـان چەور بـوو، له غیرەتـا وەک بەور بـوو، مەرڕدار هەموو خۆشی دەویسـت، به دڵ و به گیـان دەیانەویسـت، بەڵام پیـزه چـڵ وول بـوو، لاق‌باریـک و گەدەزل بـوو، چەنەوێـژ، خولێرکـاوی، گەڕۆڵ، بەیچەل، دەلاڵ، خۆ به زل‌زان، خوێن‌تاڵ، ناحەز و لێ‌نەزان، چاوشین، بەقـین، خوار و لاپـان، له خـولەی هەژار ببـووه سـندان، سـەد ناونـاتکەی لێ‌دەنـان، خولەگێژه و حوله و مل‌پان، بانگی دەکرد، سەدان بەهانەی پێ‌دەگرت، جـاری بۆ نان و بۆ پێ‌خۆر جاری بۆ کراسی چیتی مۆر، جاری بۆ کل، بۆ تاس‌کـڵاوی سوور و زل، جاری بۆ بازن و بەرموور، جاری بۆ مورووی شین و سوور، جاری بۆ کەوشی یەمەنی، جاری بۆ لەچکەی چەمەنی، چی بۆ کڕیبا، خولەی هەژار، عەیبێکی لێ‌دەکردەبار، کـراس بـا دەیگـوت: بێ‌سـەنگە، کەوش بـا دەیگـوت، پێ‌تەنگە، یان هەراوەیان تا سـەنگە. هەر پێـی دەگـوت خولەگـوله چـی بـۆم دەکری شل و وله، یان چەقره یان گوڵێ کاڵە، یا بەرتەسک و شل و شاڵە، یـا چرچ و لۆچ و بەرتەسکە، یان بێ گوڵی سـەوز و کەسـکە، یـا چـرچ و لـۆچ و بەرخوارە، یا ژاکاوی بن عەنبارە، گێژ و حوڵ سەودا نەزانی، بوویه کێوی دایـم

شوانی، حەیفە من کابانی تۆ بم، هەتا مردن ڕەنجەڕۆ بم، تۆ تێناگەی چەندە ماندووم، بڕوانە کۆما و ئاوردووم، تەندوور و کوڵان و کەندووم، کاسە و دیلەگڵێنە، دیزە و گۆزەی بە بێوێنە، قەتاری کەلارەی بە پشت، گەورە و چووکە ورد و درشت، تێر و جەواڵ، گوریس، کەژوو، خۆری خوڵە و بەن دروو، ریس، تێر و خورج و هەگبەی دووبەر، سوێنەی قووڵ و پەل و بێسەر، دەس‌گرە و ڕفێدەی نانی، تەشتی شیوی ئاووکانی. چی لەو ماڵەدا بەرچاوە هەمووی بەو دەستە سازاوە، جا تۆش پیاوی ناو پیاوانی، حۆلەکەی قەدرم دەزانی، بە ملی شکاو دەچییە شاری، دەڵێی سۆغرەی بن بێگاری، ئەوەی دەیکڕی بێ‌کەڵکە، کاری تو کەی وەکوو خەڵکە، ئەو کراسەی بۆ منت هێنا، کەی خامەک بوو کەڕکە کوێنە، هێشتا دووجار نەشۆراوە، کاڵ بۆتەوە و بێ گوڵ ماوە. کەوشەکانم گێڕ و لارن، پڕ لە تانە و عەیب و عارن، لە ناو ژنانی ئاوایی، نە ڕێزم ماوە نە بایی، خولەگێژ، ئەی حۆلەی نەزان، بۆ تێناگەی کە جلکی جوان، دڵی بە خەم پاراو دەکا، ژنی بێناو بە ناو دەکا، ئەتۆ شوانی بوویە کێوی، بە ڕەبەی شوانی کەس ناپێوێ، من ژنم لە ناو ئاواییم، حازری سەرشین و شاییم، جلکم دەبێ زەرد و سوور بێ، لە تانە و تەشەران دوور بێ، لێرە بەولا خولەگێژ، دەم پەلووڵە، چڵکن بێنوێژ، نابێ تۆ بڕۆیە شاری، جل نەناس و کۆڵەواری بۆ خۆم دەچم بۆ شت کڕین، بۆ خرید و لیباس بڕین، وردە حاجەتی نێو ماڵێ، بەشی هەتا سەری ساڵێ، بە حازر یا قەرزداری، دەیانکڕم بە یەکجاری، ئەو دەم باش تێدەگەی میرم، تۆ چەن گێل و من چەن ژیرم. دێزەی بێفەساڵ، جووت قۆشە، بێ من چ مەکرە، مەفرۆشە، بە

دارتالای چاکەسواری، بێ مـن ئەو سـاڵ بچێـیە شـاری، وات دەهـاڕم وەکـوو خۆڵێ، دەتکەمە کەپجاڕی دۆڵێ!

خولە پیاوێکی وریایە، بەش بە حاڵی خۆی زانـایە. بەهـانەی نەدا بە پیـزە، نەوەک دەس داتە نەقیزە، خەڵکیان بێتە سەران سوییە بڵێین خەڵکیـنە شـەڕ نوییە، وەرنە سەیری فرهاوێژان، شەڕی پیزە و خولە گێژان! خولە دێژێ پیـزە چاوم، هێزی ژین و هێز و باوم، خۆت دەزانی قسەی ناوێ، بێ‌تۆ تـاوێ ژیـنم ناوێ، چیت پێ‌خاسـە هەر ئەو خاسـە، چیـت گەرەکە خـۆت بناسـە، مـن لە بڕیارت دەرناچم، چی تۆ نەیێژی بۆی ناچم، پیزە خۆت ئاغا و کوێخا بە چۆنت بۆ دەڕوا هەروا بە. هەر ئەو پائیزی داهاتوو، چ پارەی کۆن، چ داهاتوو، چیمان هەبوو با بە تۆ بێ، بێنە و بەرەی شار و بەرە نـۆبەی تـۆ بـێ، نـۆبەت بـێ بـۆ شاروبەران، چیت پێ باشە هەرزان، گران، بیکڕە بۆ خۆت دەبەری‌کە، بە خۆی دادە لەسەری کە، لەچکی تەنک دەسماڵی شین.

پشتێندی شل، کراسی چین، دادرە مردم، حەریری سوور، گرێی بە گـوڵ، کەوشی ڕووسوور، وەسمە بۆ چاو، کرێمی لێو، شـانەی نـوقرە بەنـدۆکی زێـو، گوارەی ئاڵتوون قۆڵ‌بەندی قۆڵ، قۆندەرە دەم‌پایە یـا سـۆل، چـی زینەتە بـۆ کابانان، بۆ هەڵپەرکێ بۆ شایی و شین بۆ دیوانان، بۆری مەڕان بـۆ پسێ‌گەڕان، بۆ سەیرانان. من پێم‌خۆشە هەمووی بکڕی، بەهانەی ناحەزی ببڕی، تۆ لە ژنی خانان جوان‌تری، ئەگەر خۆت خاوێن ڕاگری، ئەوەدەمەی جوانـت دەبیـنم، لام وایە خوسرەو شیرینم، من شوانم بەرگم بۆ چییە، بەشی شوانان هەر شوانی‌یە، هەر تۆ جوان بی من ڕووسوورم، لە زۆربەی خەفەتان دوورم.

خولە، پیزەی فریو داوە، ئەوەی گوتی چاو و ڕاوە، پیـزە شـێت لای وابـوو ڕاستە، ڕاستەوە بوو، هاتە ڕاستە، بوو بە ژنێکی هێدی و هێمن، حەیـا بە خـۆ ئارام شەرمن، ئەوەی خولە بۆی هەڵدابوون، کـل و کلتـوور عەتـر و سـابوون، کراسی گوڵ لە سەر کەوشان، چـارۆکەی سـووری شـانە و شـان، لای وابـوو گشتی کڕیون، بێخەم بە بەژنی بڕیون. بـووە شۆڕەژنی تەڕپـۆش، لە خۆشـیدا خـۆش و سـەرخۆش، تەڕ و تـوڵ دەم بە پێکەنـین، بە خەیـاڵ گیـان و دڵ خەنین، نەیزانی خولە لاهێڵە، خۆشی ناوێ، لێی لە فـێڵە، زۆر پێنەچـو پـائیز داهات. خولە پارەی شوانی وەرگرت. پیزەشێت گوردی خۆی لـێ گـرت، لابـڕ لێی دا دوو بەشی برد.

لە تەنگەی باخەڵی هاویت، لە خۆشیان دوو بازی هاویت، پیزە گوتی خولە حۆلە، بێدەست و پل دەم پەڵوولە، هەر ئەوڕۆکە حازر دەبم، بەیانی بەرەو شار دەبم، لیباسی خۆت بکرە تەیار، سەراپا تۆش خۆت بگۆڕە، ماڵ بۆ گیانە گیـان بۆ گۆرە، مرۆ بە لیباسی بەرچاوە، ڕووتی گولییە بێناوە، خولە خۆشـی لە دڵ گەڕا، بە دڵ لەو ڕۆژە دەگەڕا، خولە بە دڵ بڕیاری دا، لە نێوەڕاسـتی شـاریدا، داوێکی وەهای بۆ دەچنم، قیرەی دەبڕم مـۆخی دەچـنم، جـارێکیتر بە یەک جاری، لە سەر دەرکا بیری شاری، بەربەیـان گزینگـی دابـوو، پیـزە خـۆی دە دەسک نابوو، خولەی مێردی لە خەو هەسـتان، وتـی هەسـتە دەستەوسـتان، درەنگە ناگەینە شاری، هەوا تاڵە، ها کە باری، مـاڵی حـاجی سـبەی شـەوێ، دیلانیانە بووکیان دەوێ، با لیباسمان فریا کەوێ، خۆ بـوێنین ئـێمەش لەوێ، کێ لەوێیە دەبێ نوێ بێ، بەرەو چاوی خەڵکی دێ بێ، خولە دەڵێ پیزەخانم،

فەزات گرم من حازرم بە دڵ و گیانم، فەرموو کەرەشین بێنەدەر، خۆی بـاوێ سـەر، مەترسـە ڕێـگە زۆر ڕاسـە، دەڵێـی تەختـی شاعەباسـە، کەری شـوانە بێ‌سەرسمە، ڕێگەناسە.

خولە و پیـزە وەدەرکەوتـن، بەرەو شـاری وەڕێ کەوتـن، خـولە بە تـوولی ڕێگایە، دەراوێنێ نیازی وایە، داوێ دانێ بۆ خێزانی، نەجاتی بـێ لە دەسـتانی بەرەڵای کـا لە نێـو شـاری، نەجـاتی بـێ بە یەک جـاری. خـولە لە فکـران ڕۆچووبوو، بۆ هەر فێڵ و فووتێ چووبوو، پێی خوش نەبوو بیفەوتێنێ، ویسـتی کەمێ بیترسێنێ حاڵی بکا، تێی‌گەیەنێ، کە ژن پیزە، بۆ کاری شار نابێ ، کار و باری بۆ بار نابێ، داوێنی خۆی لێ دوژمنە، پاڵەوانیش بێ هەر ژنە، خـولە و کەرە، خانمە پیزە، گەینە شاری بێ‌نەقیزە، چوونە خانێکی بەربـڵاو، تەڕ و بـڕ، بۆگەن و بێ‌ئاو، کەرەشینیان بردە ژووری. تفاقیان بـۆ کـردە تـووری، خـولە و پیزە وەدەرکەوتن. بەرەو چەقەی چەقەبازاڕ وەسەر کەوتن، بە تاو، بە غار، پیزە شاری هەر نەدیبوو، شار بۆ ئەو نەدیوبدی بـوو، هەراج هەڕاجـی دەس‌گێـران، هەرا و هوریای شەربەت‌گێڕان، پاڵ و بەستەی ڕێگە و بانان، فەرموو فەرمووی کەباب‌خانـان، بەرقـی گەشـی سـەرپەنجەران، زرپ و زۆپـی بێـنە و بەران، کووچەی تەنگ و قەرەباڵغ، پیرەپیـاو، منـاڵ و نابـاڵغ، پیزەیـان عەبەسـاندووە، زەین و هۆشیان بەزاندووە، لێرە و لەوێیان دەڕوانێ، خەڵک بە شێتی دەزانـێ، هێنـدە ڕوانـی تـا هەڵـکەوت، لەپـڕ لە قاناوێ کەوت، کەوتە نـاو فـازڵاوێکی، نەهاتەدەر تا تاوێکی، هـاتەدەرێ تەڕ و تلـیس، بـۆگەن، دزێـو و پاشـڵ‌پـیس، هەموو گیان بۆگەن و تەڕە، دەڵێی دێوی ئاخر شەڕە، دیسـان زمـانی دەرێنـا،

خولەی بە جنێوان ڕەپێنا، خولە ئاوری لێدایەوە، عیفریتێکە بە دوایـیەوە، دەڵێی مۆتەی سەر دەراوە، خۆی لە قیلی هەڵکێشاوە، جنێو دەدا خراپ دەدوێ، ددان لە خولەی هەژار دەسوێ، شارستانی هەر نەهێشتن، هەچی خراپە پێی بێژتن، خولە وتی پیزەشرە، خەڵکی شارستانی درە، زمان ئەوەن درێژ مەکە، چی دیم جێگا پێ لێژ مەکە، خەڵکی شاری دەس‌بزێون، گوێیان لێبێ دەتهەنگێون، پیزە ئەوەن ڕق هەستاوە، بە جنێوی سووک داوەستاوە، دەستی کرد بە جنێودانێ، قیرەی گەیـیە خیابانێ، ئەوبەرەوبەر شارستانی، پێیـان‌زانی، خڕبـوونەوە، چەپـڵە و چەقە، چەپـڵە لێـدان و پـێ‌تەقە، دەوری پیزەیان تەنیوە، سەیرێکی واکەس نەیدیوە، هەی شێت هەی شێت، دەنگی داوە. خیابـان بـوو بە ئـاژاوە، لەبەر پـاڵ و پەستەی کـوڕان، خـولە و پیـزە لێک‌هەڵبڕان، پیزەیان لە خولەی هەڵبڕی، پێی‌نەزانی جیبیان بڕی، پـوولێکی هەبوو کەم و زۆر، لێیان دزی نەناس و بۆر، پیـزەی هەژار تەڕ و تلیس، لێـی وەخـڕ بـوون نەزان و سیس، کـووچە و کـۆڵانی پـێ‌دەکەن، هەزاران ئـۆپی لێ‌دەکەن، پیزە دەگری و جنێو دەدا، ڕێگەی بدەن ڕەکێـو دەدا، خەڵک زۆرە وەک لێشاوێ، ڕێگەی نییە بازێ باوێ، پۆلیس هـاتن تـێلا بەدەس، خەڵکیـان بڵاو کرد دەم و دەس، پیزەیان بردە شێت‌خانە، گوتیـان شێتە هیچ نەزانە، شێت لە شـار دەبـێ دەرکـرێ، زینـدان کـرێ هەتا دەمـرێ، پیزەیـان بردە شێت‌خانێ، هەر دەیگوت پارەکەم کوانێ، هێندە گریا خـۆی دادڕی، شـێتەیان بە سەر دابڕی، بەرگی شێتانیان کردەبەر، لەگەڵ شێتان خرا یەکسـەر، خـولە لە پیزەی نەپرسی، دڵ بەخەم بوو و ماندوو و برسی، نمەکی شاری بۆ نەکرا،

چی بوو ڕۆیشت و ڕابرا، چی بە سەر هات کەس نەیبینی، گەڕاوە لای کەرەشینێ، کەرەشین خاوەن دەبینێ، لە خۆشیان بۆ دەزوورکێنێ پڕ بە زاری پڕ بە بینی، خولە لە ترسا دەمی دەگرێ، دەڵی شینە مردووت مرێ، مەزورکێنە ئێرە شارە، پۆلیسی ئەو شارە هارە، ورتەت لێ بێ دەتکەن بە شێت، وەک پیزە شێت، دەتبەنە بەندی شێتخانان، تا دەتۆپی سەرت نادەن، لێت ناپرسن بەرت نادەن، کەرەشین ماڵی ئاوا بێ، کەری ئاقڵ دەبێ وابێ، لە ترسی پۆلیسی شاری، زەردەی نەهاتە سەر زاری، خولەی هاویشتە سەر پشتی، یاڵلا بەرەو گوندی دەشتێ، وەک بای شەماڵ کەوتە ڕێیە، زۆر پێنەچوو گەییە دێیە، خولە و شینە گەیینە ماڵێ، جا ورەن خەڵکی لێهاڵێ، خولە ڕووداوی گێڕاوە، پیزەی لە شار لە دەس داوە، خۆشی خۆشی کەوتە گوندێ، پیزەشێت خرایە بەندێ، خولە کەوتەوە دەس خۆمان، بۆ هەمیشە شوانە بۆمان، پیاوێکی زۆر پاک و ژیرە، سایەچەورە، پێبەشیرە، هەر ئەو شوانە خۆمان بێرین، خۆمان هاوسەری بۆ تێرین، خولەی دەکەینە خۆماڵی، کیژێ دەکەین بە حەلاڵی، پیزە لەوەش بەولاوە بێ، بێبەش لەو ناوە بێ، خولە چەن ڕۆژێ تەنیا بوو، بێئاخ و ئۆخ و بریا بوو، ڕۆژێ گوتیان خولەی هەژار، پیزە هاتۆتەوە لە شار، پیزە ئەو پیزە نەماوە، سپی سپی هەڵگەڕاوە، بە کوڵ دەگرێ و دەبارێنێ، هەر بە تۆوە دەڕاوێنێ، خێرا کە زووتر بیگەیە، وەیلاوێنە. ڕووی بدەیە، بزانە بەڵکوو ئاقڵ بووبێ، بەو ڕووداوە کامڵ بووبێ، خولە تەزووی کەوتە گیانی، ڕەشهەڵگەڕا بەربەیانی، دەست و پای هاتە لەرزینێ، چی بە سەر هات کەس نەیبینێ، ڕۆیەوە بۆ پیزە دێنێ، پیزە ئەو پیزە نەمابوو، ڕەق و



تەق هەر ئێسکی مابوو، لە فرمێسکا تێر و تۆخ بوو، خاوەنی سەد ئاخ و ئۆخ بوو، باوەشی لە خوله هەنگاوت، لەبەر پێیدا خۆی هەڵتاوت، وتی تۆبە خولەی هاوسەر، ئاغای گەورەم تاجی سەرسەر، لێرە بەولاوە هەتا سەر، تۆ گەورەی ئەمن کارەکەر، تۆ پسپۆڕ و ئەمن گێژم، بەڕاستیمە هەرچی دێژم، من بۆ شار و بەرە نابم، با هاوسەروشانی شا بم، لە هەر کوێ بێ ئەمن لەوێ، بە دڵ دەڵێم هەر تۆم دەوێ. سوێندم بە هەزار قورئانێ، بە کاک ئەحمەدی سەرخانێ، لێرە بەو لاوە بێداوام. پیزە شەرتی هەتا سەر بوو، بۆ خولەی هەژار خێرودەر بوو، ببوو بە کابانێکی باش، بێدەنگ، بە بێسەدا هێواش، دەدوا لەگەڵ کۆڕی ژنان، وەک زانایان وەکوو ژنان، گوڵ لە لێوانی دەباری، نە شێتی مابوو نە هاری.

## مەلاکەریم و گێژاوی شیعری نوێ

لە خەومدا پیر و لاکەوتە و کۆڵە کوتراو نەبووم. هەرەتم بوو، چ ڕەتم نەدەبردن. دەمودووم لە سێودوو نەکەوتبوو. هەتاوی سیلە چاو و، چاوەچاوم، لە چاو نەچووبوو. چووەم تازە دەهاتە ڕوو، ڕوومەتم بە عازەبیانەوە لە هەموو ڕووان گرەوەی دەبردەوە. بازۆڵەم هەموو بابۆڵێکی پێ بادەدرا. هەرەمەی هەتاوی تین و تاوم بوو. دەمتوانی وەسەر تیرەگ و کەلەبەندەنان کەوم. بەرانی کەڵێن و نێری ڕەوەک دەداو بخەم. لە هۆبە و هەوار و لاووچان دەبووم. لەدەم بەستێنی و قەراغ زێیان گوێم هەڵدەخست، بەیت و باوی خەست و تیتاڵ و لاتاوی تراوم دەنووسی. بێ منەتی چاویلکە و قیچ و فیچی پلکەچاوان بە ڕەش و سپیمدا دەڕوانی. هەر لە دوورەوە قول و فلم بۆ هەڵداوێران. لە زاراوەی کوردی و فارسی و عەرەبی دا نسکۆم نەبوو. لە زمانی ئینگلیسی «گوودبای» و «بای بای» و هێندێک وردە ڕستەی‌تریش فێر ببووم. خەونێکی خۆش، خۆشی وا کەم هەڵدەکەوێ.

ڕاستە دەڵێن «کێو بە کێو ناگا، بەڵام ئادەمی وە ئادەمی دەکەوێ». لەو خەوەدا بوومە میوانی ماڵە مەرداڕێک، مەرداڕێکی ڕێک و پێک و زیندوو، ماڵێکی چوار کۆڵەکەی بە ماڵە سواخ دراو. تاقە و دەلاقە و سەر سندووقە کۆنەکانی لە کتێب و پەڕتووک و گۆواری کۆن و نوێ ئاخنراو. تێکەڵ و پێکەڵ و هەڵڕژاو. دڵی بەردە ڕەقیان بۆ دەبوو بە ئاو. خاوەن ماڵ ناوی مەلا

وەتمان بوو. پیاوێکی مزر و بەتام و مەلابەزێن بوو. گۆوارێکی ١١٦ـ ١١٥ی سرووەی سەلاحەددینی بەدەستەوە بوو، جاروبار لێکی دەکردەوە و لێکی دەناوە و شەق لە عەرزی دەکوتا. هەناسێکی بەدواداهەڵدەکێشا و فوویەکی هاشەداریشی دەکردە سەربار و ئەو شێعرەی مامۆستا هێمنی ڕەحمەتیشی زەمزەمە دەکرد:

«ئەو گوڵەی باغی پێ دەڕازاوە
داخەکەم ئێستە هەڵپرووکاوە»

پاشان ملی بە لارەوە دەنا و دەیگوت: ئای مام هێمن ڕەحمەت لە گۆڕت گۆڕ هەڵتەکێنە. ئێستە ئەمانە لە جێگەی تۆ سروە دەنووسن، شاعیران دەناسێنن و لاوان ڕاستاوێژ دەکەن! هەیهوو هەیهوو! بە سەد دەرزی گاسنێکیان تێ نابێ. لێرەدابوو دەبوو وە جواب بێم. لەو کۆگایە پووشکەیەک و لەو کاسە ماستە موویەک ڕاکێشم و لە ئاخ و تفی مەلا وەتمان کێش و پێوێک وەدەست بێنم. گوتم مامۆستا گیان قەڵس و قوڵی چیت؟ لەچی توورەیت و چیت لە دڵ داوە؟ مەلا گوتی: ئای کاکی میوان خۆزگەم بە خۆت، سەدبری بایە منیش وەک تۆ نەخوێندەوار و کەرە عەوام بوومایە و نەبامە مامەخەمە و خەمم لێ نەشێوابایە! گوتم: وانیە مامۆستا من کەرە عەوام نیم، بەشی خۆم دەزانم. خوێندوومە. خێرۆکە سەوادێکی دێهاتیانەم هەیە. دەمی ورچ و گورگ دەبەستم. یاسینی گەورە و تەبارەکی چکۆلەم لەبەرە. چۆن بە من دەڵێی کەرە عەوام! مەلا وەتمان باوەڕی بە چاووڕاوم نەبوو. دەستی کێشا

و سرووەی لێک کردەوە، ژمارە ١١٦ـ ١١٥ لاپەڕەی چل. کاروانی شێعر. گوڵئەستێرەی سەرکاروانی لەبەر دەم دانام. گوتی: فەرموو کاکی میوان بۆم بەگژ ئەم ڕستە شێعرەدا بچۆ بزانم چیت لە بارانـدا هەیە و شاعیر لەم ڕستە شێعرەدا چی بۆ شاردووینەوە؟ ئەوەیە برام سروە نووسەکان گاڵتەمان پێدەکەن. چۆن بەخەم نەبم، چۆن بۆ مامە هێمن خۆم دەقوڕ نەگرم و چاو هەڵنەپاڵێوم؟بە زەردەوە گوتم: مەلا وەتمان گیان من و تۆ لەم جۆرە هەڵبەستانە ناتوانین مەبەستێک وەدۆزین. زۆربەی کاروانی شێعرەکانی ئەمڕۆکەی سروە، بەرەو زەوی بەڕێ ناکرێن، زۆربەیان مەلەکووتین، حاسمانین، ڕوو بە عالەمی مێتافیزیکی و ئەودیوی نەدیومان دەڕوانن. خاوەنی ئەم جۆرە هەڵبەستانە، بە هەڵە هەڵناکەون. بەستان بەبێ مەبەست دانابەستن. وەک من و تۆ لە حوجرە قوڕینەی تەڕوبڕ و قوڕنەی تاریک و تنۆکا دەرسیان وەرنەگرتووە. ئەوانە لە زانستگە و زانکۆی وەهادا ڕاهاتوون و چوختی کراون، کەرەسە و نوێن و بانیان بردۆتە سەرگەدەی مانگ و تەرازووکۆیان بە کۆما لە کۆ داون، زانست و دەسەڵاتیان گەیاندۆتە قەڵای نێپتۆن و پلۆتۆن. بە گای حاسمانی زەوی خەرمانەیان کێڵاوە و بە توور و کەلەم و گێزەڕ دایانچاندووە و مێکانیزەیان کردووە! «نان دەشۆرباوی شینی حاسمان دەگوشن! سەرهەڵێنە، چاوەکانت بۆنی تروسکەی شینی حاسمان دەدەن! هەر مەبەست ئەو سەرکەوتنەیە!» شاعیری نوێ دەبێ نوێبێژ بێ و دەگژ نەبێژراوان ڕۆچێ. بوورە و بەیاری ڕەقەنی وڵاتی مەلایکەتان بە تراکتۆری حاسمانی و گاسنی نووک

تیژی تیشکی ڕۆژ بە شێوەرد ببڕێ و وەردی بداتەوە و بەرهەمی بەستە و پەخشان و ئازووقەی وتاریان لێ وەربگرێ! ماموٚستا مەلا وەتمان! ئەمجۆرە هەڵبەستانە لاوەکین، ئاوەکین و ڕوویان لە ماڵی تۆ، یانی وڵاتی کوردان کردووە، هەر بە لاوەکیان بزانە، نە ئاوڕیان لێدەوە نە لێشیان بڕوانە! (شتر دیدی، ندیدی!)

مەلا وەتمان جگەرەیەکی داگیرساند. بزەیەکی تێگەڕا، گەرووی بۆ کلۆر کرد و گوتی: برام بەڕاستی باشی بۆ چووی. ڕەنگە سەوادت زۆر کەم بێ. بەڵام گژمێک بۆچوونی باش. باتمانێک سەوادی بێ کەوش و کڵاش دێنێ. لێکدانەوەکەت ئەوندە ڕێک و پێک و جوان و بەجێیە، بۆ ئەوە دەبێ بۆ «سروە نووسەکان» بنووسی: برای چاک بن، ئێمەی کوردستانی هێشتا دەستمان بە ئێوەی زەوی ڕانەگەیشتووە، بە زمانی حاسمانییەکان دەگەڵمان مەدوێن، با لە خۆمان تووڕە نەبین و سروەشمان لێ نەبێزرێ! لەو دەمەدا لەخەو ڕاپەڕیم. بەداخەوە نە وەتمان مابوو نە باتمان!

## بەسەرهاتی نێچیروانێکی پیر[1]

وێنەی ڕۆژێک ژیان لە ژیانی هەموو لادێیەک

مانگی خەرمانانی پەنجا و یەکی هەتاوییە. باوی ئاغایەتی گەرما و هەتاوی تاوێنەر، ئاشی زەوینی لە سەر بستەی ئاگرین ئەسووڕان، ئاجوول و باجوولەکانی قوونەزای گەرما بەرەو چاو هەڵئەبەزین و سامیان لە سەما ئەباران، باڵدارە تووکنەکانی چیاویست لە بن ڕەوەزی سێبەردا بە دژی هێرش و هەڕەشەی هەتاو، باڵیان کردبوو بە پەڕەشووتێکی نیوە هەڵدراو.

کەشە هەورێکی هەوریشمی و کون‌کون و ساویلکە، ئەیهەویست دژی مڵۆزمەکانی گەرماهاوێژ، سێبەری خۆی بۆ سەر زەوی ڕاستەوڕێ ڕاکێشێت. کزەبای باکوور ئەیهەویست بڕاسێت، بڕاسێت و بە باوەشێنی شەداری هەناسەی کوورەی گرپرپشکێنی هەتاو لە گڕ و گەڕ بخات. ئەیهەویست پاپاغی ئاغایەتیی هەتاو و جوولەجوولی ژیلەمۆی سەبوون، بەرەو ڕووی نەبوون و تیک‌شکان ڕاشکێنێ، بەڵام ئەوەن بە سەر شاخەکانیدا غاوی داخشابوو، پەڕ و باڵ پرووزاو مەتەڵۆکی «کاسە لە چێشت گەرمتری» ئەخستەوە بیر. خۆی لە گڕ گەرمتر و هەناسەی لە هەناسەی هەژارە بێ‌شێوەکان سووتێنەرتر بوو.

بەڵێ برا گیان، هەر لەو کاتەدا بوو کە لە بیرم نەکردووە و قەتیش لە بیر ناکرێت، کە خۆم و کراسە دیوەکەم و تفەنگێکی ساچمەڕژێن، لە بەرزترین

---

[1] ئەو کۆما سۆمایەش، دەسپێکی هەوەڵ نوای تەمەنی نووسەرن، ژیلەمۆی کڵی ئاگری نەورۆزی ئەوان سەردەمانەن. ویستوویانە خۆ لە ئامێزی بەرنامەی «تاپۆ و بوومەلێڵ»ی سوارە باوێن. بە هۆی کەندوکۆسپی تایبەت بەو کات، لەو کاروانە شۆخ و شەنگە بەجێ‌ماون.





چیای مەڵبەند و لە ناو گاڵۆکی شاخی کونە پڵینگڕا لە ڕاو بووم. بەڵام شەکەت و ماندوو لە تاوی گەرما پەسارە شاخێکی خاوەن سێبەرم کردبوو بە پەنای ئامان.

چ بڵێم و لە کوێوە دەس پێبکەم. دیمەنی ئاو، ئاوێکی سپی‌تر لە چاوی زێو، ئاوێکی شەکەتی‌شکێن و گیان‌بووژێنەر، کە لە ناو دڵی بەردێکی دڵڕەقا هەڵئەقوڵی. هەڵئەقوڵی، دڵۆپ دڵۆپ، وەکوو فرمێسکی هەتیوێکی بێ شێو. ڕوو بە داوێنی شاخ ئەهات و ئەکشا، ویتەویتی چۆلەکەی چیلویست و بەرزی‌پەرست، باریکە دووکەڵێکی شاویلکەی نێوچیروانێکی پیر، کەبابی کەوی برژاو بە پووش و پواری وشکی لێرەوار. چادانێکی چکۆلە و دۆلکەیێکی هەنگڵ لێزاو، چەکێکی ساچمەلێدەری ڕازاوە بە تەنەکەی زەرد و سپی، کراسە دێوێکی خالاوی بە ئالەبووکی ئاڵ‌ووالّ، گەورەترین بەڵگەی خۆشی ژیان و بەرهەمی کۆساری سایە چەوری ئەخستە بەرچاو.

سەرەڕای ئەو هەمووو نوێنگەی بەدیمەن و ڕوانگەی بایەدار، هەروەکوو مۆتەکەیێک چنگی لە گیانم تێپەڕ کردبێت، گیان و لەش هاڵۆز، وێنەی خۆم ئەهاتە بەر چاو. ئیتر نازانم چ سرێک بوو، کە لەشی لە سڕی و دڵی پڕ لە خەم هاخنیبوو. هەروەکوو پەرییەکی پەرزێرین، لە ناو پەردەی حاسمانەوە پەردەی گوێم هەڵداتەوە و بڵێت. بڵێ: ئەبێ لە ڕەقەن و کێو و چیا ماڵئاوایی بخوازی و بۆ هەمیشە ڕوو بە ماڵ ڕاوبەتاڵ ڕاگەیێنی.

بەڕاستی هەواڵێکی سەرسووڕهێنەر و خەیاڵێکی کوت‌وپڕ و تازە لەدایک‌بوو بوو کە لە هەڵەشە و هەوڵ و سام پڕی کردم. هەروەکوو گیانم لە نیوەنووزەی کاوەی کورڕم بێت، کە لە بێشکەدا دەس و شان بەستراو و یا لە سەر کورسییەکی تەڕ و شێدار و مێشاوی فرمێسک برژێت.

بەو خورتە و خورپەوە، زۆر بەپەلە و هەرەشاوی کەرەسەی ڕاوم تێک‌خست. هەروەکوو لاوێکی بەهێز و چیاپێو. بە هاوکاری شەقاو، شەقامم

شەق کرد. شـەکەت و مانـدوو لە خـانووچکەیێکی بە گـڵ و بەرد هەڵچنـراو، سڵاوی خۆم ڕاگەیاند، بەڵام چ سڵاو، خانووی بێ کابان و سڵاوی بـێ وەڵام و گاڵتەی قرِوقەپی، سـامی لە سەر باراندم.

لەو هـۆدەدا جیـا لە هەنیسـکی خەفەتڕژێنـی کـاوەی پاشـەبەرەم، پاشـەوارێک لە شـوێنەوار و مونـاتی مـاڵ وەبەر چـاو نەئەکەوت. وا دیـار بـوو دیمەن و چیمەنی کچم گاگەلیـان بـۆ چەیـار لـێ خورِیبـوو. دایکیشـیان بـۆ مەرِدۆشـین ڕوو بە چیـای گـۆڕبەران هەنگـاوی نـابوو و مـاوەی چـوون و گەرِانەوەشی سـێ کـاتژمێری ڕەبەقـی ئەخایانـد. تەنیـا کـۆڕپەیەکی سـاوا و قوونەنشینە، کاوەی مەکۆی هیوا، بە هیوای مەمکەمژەیەکی چلکـن و شـیرین کراو بە ئاو و قەند بەجێهێڵرابوو. بەڵام چ مەمکەمـژە، مەمکەمژەیێکـی بیـر و مێشـک کوژ. ئەو مەمکەمـژەی کە ئێسـقان و دەنگـی منـاڵێـک بەرەو زەردی و شلی ئەبات. ئەو مەمکەمژەی کە بۆ هەتا هەتایە نەخۆشی جۆراوجـۆر ئەخـاتە ناو خرۆکەکانی بۆریەی خوێن و لەشی هەمـوو منالێـک بەرەو لاوازی ئەخـاتە سەر.

بەڕاستی بەڕاستی دیمەنی کاوەی گریاو تا ئەو جێگایە سەرنجاوی بوو کە وێـنەی ژیـانی هەمـوو منـاڵە لادێیەکـی تیـا دیـار ئەکەوت. ڕاکشـاو، بەڵام ڕاکشاوێکی ڕاست و بێ گرێوگۆڵ، کە لاڕوومەتی چەپی خۆڵاوی و ڕوومەتـی ڕاستیشـــی بە زەویـــیەوە چەســـپابوو. هەروەک پەپـــوولەیێکی لاواز کە لە بەرەبەیـانی بەفرانبـاردا لە بەر سـرِی، بـاڵی بەسـرابێ. یـا وەکـوو ئەسـیرێکی ژێردەسـتی بێگانە کە لە ژێر شکەنجە و عەزابا لە خۆ چووبێ. جیا لە هەنیسک و هەناسەیێکی باریک، بەڵگەیەکی نەمردنی لێ نەئەبیندرا.

ڕوون‌تر بڵێین: ئەو کورِە، ئەو منالە سـاوایە، شووتیلکەیەک بوو پانەوە بـوو کە بە مێشـوولە و زەردەواڵە گەمـارۆ درابـوو، هەر لەو کـاتەدا بـوو کە دایکـی وەکوو خێو و دێوەزمە ڕاوی نابێ، برِووسکاو و هاڵۆز، شل و شێواو لە ئـارەقەی



شەکەتیدا وەژوور کەوت. هەرکا کوڕەکەی درێژ و ڕاکشاو وەبەرچاو هات، بە شەقژنی گریان و نیوەنووزەیەکی پڕ لە پەژارە وی: ناکا دیسان، ناکا دیسان کوڕەکەم هەروەکوو ئەوەی تر لە بەر بێکەسی لە ناو ئاوردوودا هەڵقرچابێت، ئاخ چەن چارەڕەش و ڕواوە کۆزم.

بێ‌ئەوەی لە بیری بێت کە کۆڵەشیرەکەی لە زەوی دانێت، باوەشی کردە بێشکەیێکی دڵداری و هێمن‌هێمن بۆ کوڕێکی ئێسقان شل و لاوازگە. زۆر بە پەلە بەرۆکی خۆی ترازاند و مەمکی ڕاستی، بۆ ڕاستەوخۆ کرد. ئەوەی کە دیمەن‌دار و سەرسووڕهێنەر بوو ئەوە بوو کە ئەو کوڕە نە تەنها مەمکی نەگرت، بەڵکوو بە ڕاسانێکی پڕ لە تووڕەیی سەر و پرچ و بەرۆکی دایکی ئەڕنی. هەروەکوو فامدارێک ڕوو بە جێگا تەڕەکەی ئەخشا. سەرئەنجام هێند خشی، خۆی گەیاندەوە سەر جێگای هەوەڵی و لاچاوی بە زەوییەوە شەتڵ کرد. لاقە شل و سووڕاوەکانی نیوە درێژ کردن و بە هەنیسک و هەناسەیەکی باریک لە ژیانی پڕ لە بێ‌نازی بێزاری خۆی دەربڕی. مان و تووڕەیی تا ئەو جێگایە ڕۆیشت، کە ئەتگوت لە ژیان وەڕەز و لە مان ماندوو بووە. هەروەکوو نەیەوێت لەمە هەورازتر بێ‌نازی خۆی بخاتە بەرچاو، چاوی لێک ئەنا و لە سەر جێگا تەڕەکەی بە هەنیسکێکی گڕدار لە ناو گیانی دایکیدا ژیلەمۆی پەژارەی بە فوو ئەکرد. زۆر جاریش بە مۆنەوە دیمەنی دایکی ئەخستە بەرچاو. بە زمانی بۆڵ و منداڵانەوە لە بەر خۆیەوە ئەیورتاند. هەروەکوو بە دایکی بڵێت و پێی بڵێ ئەو شیرەی کە بە شەکەتی ڕێگا ڕۆینی نیوەڕۆ برووسکابێ، یا بە تینی هەتاو بێتە کوڵین، نابێ بخورێ. خواردنی ئەو شیرە زەردی‌هێن و ڕشانەوە و زگ‌چوونی لێ هەڵئەقولێت.

ماوەیەکی هەروا قارومانی منالێکی ساوا تێک نەئەشکا. نە بە لایەلایەی دایک و نە بە دڵدانەوەی باب، لە جێگا تەڕەکەی لەشی کلا نەکرد. هەر ئەودەم و ئەو کاتە بوو کە هەتاوی کچە گەورەم، لە مەزرا ڕوو بە ماڵ هاتەوە

و ئەویش پەژارەیەکی تری بۆ منی باب رواند. ئیتر نازانم چ بوو و چیم لێ بە سەر هاتبوو کە لە قونجرێکی ماڵەکەما ئەمهەویست بێدەنگ و کزەڵۆک وەک هەلاجێکی لۆکەشکێن، لە ناو ماڵی خەیاڵما خەریکی پشکنین و بەرجەوەندی بووم. ئەمهەویست وەکوو زانایێکی گیان‌ناس لە مەستی هەستی ساکار، بارێک ئاکار و ئاساری ڕاستەقینە وەدۆزم. هەوەڵین سەرنجی هەتاو، هەتاوی کچە گەورەم موچوڕکی مەرگ و ڕاچەنینی پێ چێشتم. دیتم کە گوڵی سووری ڕوومەتی وەکوو گوڵێکی ژاکاو ئەیەویست لە جوانی ماڵئاوایی بخوازێت، قژەکانی بە پەڕۆیێکی ڕەش و شرۆڵ پێچابوو. دوو پێ لە ناو پاتە شرێکی قیریندا وەکوو چەوەندەرێکی نیوە کوڵاو کەفوکۆی کوڵانی لە سەر هەڵچووبوو. گۆمیلکە فرمێسکی چاوی لە ڕووی، لە سەر گوڵی ڕوومەتی بە هەتاو گەزراوی پێئەکەنی. دیمەنی چاو و چەنە و لاجانگ، حیکایەتی لە کۆمەڵێک شیوەن و گریان ئەکرد. هەروەکوو بە گوێیدا چپابێت کە باوکی نەیدا بە پیاوێکی تەمەن‌داری سەر و سمێڵ سپی. ئەیدا بە نۆکەرێکی کۆڵ‌کێش و دەس و پێ ڕەشی بێ‌دیمەن، نەیدا بە زاوابەند. بێ ئەوەی بیکەن بە بووک، بێ ئەوەی هەرێمی زەماوەند و ڕمبازی و لۆغانە ببینێ. ئەبێ لە شەوێکی ڕەشا بە سیپاڵی ڕەشەوە لە قوونجرێکی ڕەشەوە لەگەڵ دێوەزمەیێکی ڕووڕەش، ڕەشایی ژیان بە دەس بگرێت. زۆر جاریش وەها بوو کە بزەی ئەکەوتە سەر لێو و کرێژی پەژارەی گۆڕ ئەکرد و لە دڵی خۆیدا ئەیگوت: نا نا، هەرگیز هەرگیز، باوکم قەت ئەو کارە ناکات و نایکات. باوکم ڕووناکبیر و گەڕاو و خاوەن‌تەجرەبە، هەرچی بێت هەستی بابی و بەرجەوەندی زانایانەی ئەبنە بەرگری تاوانی ئاوا گەورە و زوڵمی وەها گیان هەڵوەشێن. ئەگەر بێتوو بابم ئەوەم لەگەڵ بکات ئیتر هەموو شت بۆ من تەواو ئەبێت و بەس، ئیتر من و پەتێک و سێپەکی مەشکەژێنەکان! یا من و تۆزێک دەرمانی مەرگەمووش یا سەکوژا!

بەڵێ برا گیان، ئیتر ماڵەکەمان هەروەکوو پەپووی قەدەم قودوومی نەهاتی قەدەمی تێ نابێت، و پەپوو، پەکووی تێدا خوێندبێت، ببوو بە کەلاوەیەکی هەراوی خەمباری و ماتی باڵی رەشی بە سەرا کێشابوو. دایک و باب و کچ و کوڕ هەریەک لە قوونجرێکا لە کۆمای خەیاڵی خەمپێو و خەیاڵ پەژارە بوون.

هەر لەو ڕۆژەوە ئیتر چەکم فڕێ داوە، لە ژیانی ناوچەی بن کێو بێزراوم، گردەنشین و بێ ڕاو، دوورە گۆشت پۆڕ و کەو و... بێ هاودەم و نەخۆش و کرێژاویم. لە کاروانی کەڵک ڕۆینی هیوا جێ ماو و لە ناوچەی چیای تاریک بەبێ چۆلەچرا، نیوەماو، بە دارە کوتە هەروەکوو منداڵێکی تازە پێ گرتوو ئەمەوێ بڕۆم بە ڕێدا، بەڵام کام ڕێگا؟ ئەو ڕێگایەی کە هەموو ڕێبوارێک تیا بێ سەر و شوێن و گوم نێو و بۆ هەمیشە نادیاری، بەڵێ نادیاری کلۆڵی هەرە گەورەتر و گەورەتر لە هەموو شتێک ئەبێ کوڕ و کچەکانمان، شوانە گاگەل و کۆڵ کێش! دوور لە زانست و زانستگا، پێ و پل قلیشاو لە ژێر پۆلە درووا بێن بە درووی ناو کۆمەڵ.

ئەوە بوو هۆی وەڕەزی و زویریم لە چیا، ئیتر چاوەڕوانی هەنگاوی ئێوەی خوشک و برام تا کاتی دیداری برایانە و هەتا کاتی یەکتر دین خوا حافیز.

# چاوچنۆکی ڕاوچییەکی بەساڵاچوو

لە سەر سەکۆیەکی بە بەرد و کولـۆ هەڵچنـدراو، لە بەردەمـی پەنـجەرەی وەتاغەکەما ئەمەویست تـاوێ پشـوو بـدەم و لە خەم ببـڕێم. چنـۆکی چـاوی تـامەزرۆ بە ڕاو، داوای لـێ کـردم کە چـاوێ بە چیـای بەرز و خەمڕەوێنـا بخشێنم.

دەمەویســت بە دووربینێکـی نەخـۆش و چـاو عەمەل کـراو، بە خۆشـی ڕانینەوە پەژارەم بڕەتێت. بەڵام خەم نەوەک نەڕەوا، بەڵکوو بە هەر تماشـایەک و سەرنجی خەمێکی نوێ لە سەر باری خەمم ئەنوا.

نازانم چی بوو لە چیا چ قەومابوو. کەوا شاخ و ڕەوەز و ئەستۆی بستوو، لە تەم و ڕەشـایی سـێبەرا ڕەش‌پـۆش و پەژارە پریشـکێن بـوون. کەوا بـووکی گڵووکی نواڵ، سیپاڵی سەوز و سوور و ئاڵیان لە ناو تـوێی نشـێو و پاڵـدا پـاڵ ئەخست.

چـــپەی پـێ هەڵات هەڵاتـی پەل و پـۆپ و گەڵا، پەلەکـوتە و قـولاتی قانگەلاشی لەش جزاو بە هێز و بابەخولەی بای سەروی وڵات، هەواڵی پاییز و کەند و کولۆی خۆش‌ڕنی زستانی بە گوێی چیا و چیاچێکانا ئەچپاند.

شێوەردی شین بە پۆلە کۆتر و دەراوی بە پـۆڕ و کەو هاخنـدراو، دووبـارە عەجوولی ڕاو و چوونە چیای لە هەموو گیانمدا شین کرد.

خۆم بە خۆم ئەگوت: ئاخ ئاخ! ئەگەر لەبەر گەڕی پیری نەبا، دەستم ئەدا چەک و بە شنەی شنەبای ڕاوی چیا خەمی کۆن و نوێم بە با ئەکرد.

بەڵام نا نا، هەرگیز، لەمەولا مەحاڵە خەیاڵی چوونە چیا، گۆر کرێت و بار و بنەی ژیان ڕوو بە گۆڕایی و دەشتی تێک نرێت.

وا تەمەن لە پردەبازی کورێنی و لاوی قەڵەمبازی دا، کزەبای توانا ـ هەڵوەرێنی پیری وا هێز و بڕی جوانی، پەرین پەرین کرد و کولوو کولوو پیتەڵۆکەی سپی لە سەر سەر و ڕوومەت و سەرم سەپان. کۆخەکۆخی هەناو و ژواری پێوپل و لەش، بەبێ شەرم و شکۆ ئەڵێن: پێم ئەڵێن مامە پیرە، چەک و چوونە چیات خەیاڵ پڵاوە ڕاوەکێوی ڕەوەکت خەونێکی گەلێ دوورەتەعبیرن. ئیتر کاتی عەینەک و وەکاز و هێواش جووڵانەوەی و بەس. کاتی چەکدار بوون بە پێنووس و خزمەت بە شاڵ و گەل و نیشتمانی خۆشەویستن.

هۆی هەڵۆی بەرزەفڕی و فیزی ژیانی نوێ، مەبەست کردنی ڕووداو و بیر و خەیاڵ و هەستە. ئیتر بە پێ هەواڵێ کە هاواڵی پیری پێی دام، ئەبێ بڵێم، ئەبێ بڵێم و بڵێم:

پیر بووم و هێزی چیا ڕۆییم چوو
ڕاوە کەوبار و چرەی خۆییم چوو
دوورە دەسگیر و لە خەم پێ پەستم
زەرد و بێ نوورە لە بەر با، هەستم

شـــەق لە بـــن پیـــل و لە ژێـــر پـــیلانم
کـــــۆن و لاکەوتە دەبـــــــێ هــــــێلانم
چینەچـــــی شـــــاخ و دژی کــــــۆپەینم
ڕوو بە دەشــــــــتایی گەلــــــێ بــــــێزەینم
چـــۆن بچـــم باشـــە هـــونەر بـــی نـــیمە
هەر هیـــوام مـــاوە، هیـــواش خـــۆش خـــیمە
ئەو بـــــــــرایەی کە لە کەل وەمگـــــــــوێزێ
خـــۆی بە خـــۆی دا و لە مانـــا ڕێـــزێ

## ژیانی ناو کەژاوەی بەردین

کیژۆڵەیەکی جوان بەڵام جوانەمەرگ هەنگووتووی شەختەی ناکاو، ژاکاو و دەس لە هیوا پساو، تاقانە بووکی گۆڕستانی کۆن، میوانی وڵاتی ژێر زەوی، سەر لە سەر سەرینی بەردین و لالەش لە سەر ڕایەخی قورین، خەوتووی خەوی یەکجاری، بە نێوی خەزێم، بەڵام خەزێمی کەپۆی بێنازی و گوڵی سەد تەرزی خەفەت و مەینەت هارووژێن.

نەشمیلەیەکی بەدیمەن و بەرچاو، شل و قژکاڵ و هەڵکراو، ئاسکێکی بەهەست و پەپۆنەخشێن، کۆمای ئەوین و موچوڕکی تامەزرۆیی کۆلکەزێرینەی چیای بەرزی ڕوانین، ڕەوت و هەنگاوی هەنگاوتەی دڵ بوو. هەڵوێستی گیان هەستێن و نیونیگای خوێنوەستێن بوو. ڕەوەک و ئێسک سووک و خۆش ئاوڕ، ئاوڕی ناو نزاری دڵداری، هەوێردەیێکی نەرمی هەرێمی تامەزرۆیی، شەوەی گیان هەڵکوشی ناو جۆلانەی لاوی، بەڵام هەژار و دەسبەتاڵ و بێسەلا. خاوەنی دوو برای وردیلەی باب لە گۆڕ کەوتوو، لەگەڵ دایکێکی پیر و لەش بە مۆریانەی پیری خوراو، لە ناو باوەشی خانوولەیێکی ڕەشی فەقیرانەدا ئەژیان. بەڵام چ ژیان، ژیانی بە ڕەنگ و ژاراوای، ژیان لە ناو گۆڕی ڕەشی هەژاریدا. ئەویش لە ناو هۆزێکی ئاژەڵدار و دوور لە هاژوانی سەرنج و زانست، دوور لە بزەی بەزەوی هاتن و ئاوڕی بەبایەخ.

ئاخر لە ناو کۆمەڵی چیاگەڕ و مەڕدار، هەژار بێبایەخ و ئێسکدزێو بە جیساب دێت. کەوابوو کیژۆڵەیێک کاڵ و شەرماوی، بۆ ڕاگرتنی نازی دوو برای هەتیو، ژیانی پێویست، ئەبێ خوو بە کێ بگرێت و ڕوو بە کام یاسا بێت؟ چارە چییە؟

بۆ تاوانی تارمایی هەژاری و بۆ ویستی ژیانی دایکی بیمار و برای ورد و بێباب، خەزێم ئەبوو شەو و ڕۆژ خەو هەڵبڕێت و ئارەق بچێنێ و لە مەزرای ئەم و ئەودا دڕوو هەڵکەنێت و پەژارە شین کات. ئەبوو کاکۆڵی بە شانەی شەڕەباوە ئاڵۆز و پەنجەی بە خەنەی ڕەنجەوە ڕەنگین بێت. بە هەڵکێش و سیپاڵی پیاوانەوە لالەش بە تینی هەتاو پێی چێت. بەبێ یاسای کۆمەڵی ناو شاخ و داخ، ئەبێ تا دوو برا بە کاک نەکات، قژەکانی بە هاواڵی شانە نەکات. نە بۆ جوانی لەش و نە بۆ خۆشبێژی ئەوین، خاون ئاوڕ بێت، خەزێمی تەمەن هەژدە و هەژارمژ، بێ وچان و پشوودان لە بازبازێنی ژیاندا شەکەت و ماندوو و ژاکاوە، جێگا هەڵوەرینی شەوانەی خانووچکەیێکی ڕەش و جێوبانێکی شیتاڵ و چڵکن بوو. هەروەها شەو و ڕۆژ و ساڵ بەرە بەرە، بەربەیانی خەزێمیان بە لێڵی ئەشڵەقاند. سەرەڕای دەردی بێ دەوای هەژاری، سەرەڕای هەستی بێکەسی و دووره دەروایش. ئاژاوەیێکی تری پڕ لە مۆنج و سێلاوێکی خنکێنەر هورووژمی بردە سەر خەزێم و سەرەڕای ژیان و پڕ لە ژان و چڵکن، خەزێم بە دیتنی کوڕە سەرکۆمارێک دوو پێ کەوتە ناو ژیلەمۆی عیشق و ئەوین و دڵداری، و هەموو توانا و هەست و بیری ڕاوپێچ کرد.

## پردی سـولـّتان[1]

بەرەو هەتاو وێنەی ژیانی لە نـاو چیـای مەڵبەنـددا، وەکـوو وێنەچییەکـی لێهاتوو هێناویەتە سەر شانۆی نوانـدن. دەبـا تـاوێکی لە خەم ببـڕێم و ڕوو بە پردی سولّتان وەڕێ کەوم. بـۆنێ لە گڵـووکی چەم کەم و چـاوێ بە دیمەنـی ئەو پردەدا بخشێنم. گوێ بۆ دەنگی بولبـول و قاقـای خاسـەکەوی ئەو دەر و دۆڵە وەگرم و گیـانی بـوردووم وەبووژێـت و بە یـادی ڕاوی ڕابـردوو تەمەنـی تێپەڕیوم توخواکەی بـا بە فرمێسـکی چـاوم، زۆرەبـانێ لەگەڵ کەف و کـوڵی سێڵاوی ئەو چۆمە بگرم.

ئەو پـردە، پـردێکە کـۆن و لەمێـژین، سـاڵ و دروسـتکراوی دەسـتی زانایەکانی [هەزار] ساڵانی لەمەوبەرە.

بۆ بەکارهێنانی لەشـی ئەو پـردە، گاشـەبەردی سـاکار و نەتاشـراو بە کـار هاتوون. وا دیـارە بـۆ دروسـتکردنی ئەو پـردە، مامۆسـتاکەی، هەر لە بەردی داوێنـی ئەو کێوە کەڵکی وەرگرتووە.

ئەو پردە بە درێژی دە گەز و بە پانی دوو گەز، لە سەر سێ پێ ئەوێستێ و دوو قەیسەری واتا دوو گونجەی ئاوڕۆی لێ دەرکراون.

ئەو پردە لە ناو باوەشی کێوەکانی «گردەگروێ و باغی بـاڵەکوو و دۆڵەڕەش و ڕەزاکوژاو» لە سەر دەراوێکی ئاو هەڵڕێژ و چۆمێکی ورەبەر دروس کراوە.

---

[1] پردێکی مێژوویی تایبەتە لە مابەینی گوندەکانی سلامەت و ساردەکۆساندا هەڵکەوتووە.

لە ناوچەی گەورکی موکری و سەر بە شاری بۆکان، ئەو پردە لە سەر زار و زمانی خەڵکی مەڵبەند زۆر بە قوتب و فەڕ و خاوەن حورمەتە. ئەگەر ئەو پردە نەبێ، هاموشۆی کاروان و پیادەڕۆ لە سەردەشتەوە بۆ بۆکان ئەبەسترێ.

**سەرچاوەی ئاوی ئەو پردە:**

سەرچاوەی ئاوی ئەو پردە لە هەرێم و مەڕ لەوەڕێنەکانی گوندی خورخورە ئەڕازێتەوە. جۆگەلەی خڕۆکەکانی «**گوێزی، فەرخۆلە و کۆخان، ڕند** و بەفرەکانی کێوی **عەلیەقوت** و **خڕی بووکان** و **داری سەیدی**، ئاوی چاوی چاوەکانی **خڕی حەسەن‌ئاغا** و **باغی** و **خاڵەمزە**، فرمێسکی ناو داوێنی **مامچەڵەبی** و **گولان** و **داودە گردە**[1]، بە کۆمەڵ ئەو چۆمە پێک دەهێنن.

بەر لە بەسترانی ئەو پردە بە واتە و چیرۆکی کوردەکانی مەڵبەند، ئیمامی عەلی خوای لێ ڕازی بێت، ڕێگای کەوتۆتە ئەو دەر و دۆڵە و ئاوە سەر ڕێی پێ گرتوون و دوڵدوڵ سوار زۆری بۆ دوڵدوڵ هێناوە لەو دە گەزە بازی داوە. بازی داوەتە ئەوبەر لە سەر بەردێک ویستاوە. ئەو بەردە شوێنە پێی دوڵدوڵ و جێ چەکمەی ئیمامی عەلی هێشتا لێ دیارە و هەتا هەتایەش، هەر دیار ئەبێت. ئەگەر باران ئەبارێت، ئەو شوێنە پێیانە لە ئاو پڕ ئەبن، دائەوەستن.

بە ئاقیدەی خەڵکی مەڵبەند، ئەو ئاوە بۆ هەمووَ دەردێ شیفا و هێمنی‌هێنە.

---

[1] هەموو ئەو کێو و کەژ و چیایانە لە ناوچەی موکریان و هەڵکەوتووی ئەوان هەرێم و مەڵبەندن.

# هیوای نیشتمان[1]

جاده خاکی و چاڵ و چۆڵ و بەردەڵانە، بارانی بە بڕشت و لافاوی بە هەڕەشەی بەهاری، پشتی ڕێگەکەی شکاندووە، هەموو جۆرە ماشێن زۆر بە حەستەم دەتوانێ تێپەڕ بێت. تا بەرەو چیا دەڕوات، پێچ و پلووچ، وردە پردۆکەی لاڕووخاو ڕەوتی ماشێنەکە خاوتر دەکاتەوە برەم برەم دوو کاتژمێرە ڕێگە دەبڕین. بۆ شار هێشتە نیوەڕێگە نەبووین. لە زۆر شوێنان دادەبەزین هەوای ساردی کوێستان دەمانگەزێ، داو و دەلینگ تەڕوبڕ و قوڕاوی، هەر دەڵێی ئاودێری زەوی نەدێراوین، ئاسمان لە حاستمان ترش و تاڵ و ڕووگرژە. مژ و هەور و هەلا تێکەلاون کەڵکەڵێنی ڕەشەباش ڕەنگە باشمان وەڕێ نەهێنێ.

ماشێنە بۆریش بێبەندوبارە، جاروبارە مان دەگرێ. بە هەزار سەدەقە و نەزر و مەولوودی بۆ کاک مەمولوودی شۆفیر هەڵدەبێتەوە. سوارە و پیادەی سیخوار، سەرەوخوار، یەک لە دووی یەک، بۆمان خوار دەبنەوە. هەر دێ و ناوچاوانی، حاسمان ناحەزتر دەبێ و گێژەڵووکەی پیتەڵۆکان بەهێزتر دەکات. موسافیری ماشێنە بۆر نەترەیان لە دەس داوە.

---

[1] ئەم چیرۆکە وا دیارە بە شێوازی ڕۆمان داڕێژراوە. هەربۆیەش لە کۆتایی کتێبەکەدا هاتووە. ئاخەرین بەرهەمی چیرۆکی نووسەرە.

شەو بە سەر دابێ، دابی ژیان تێک دەچێ و نۆبەی مەرگ دێتە گۆڕێ. کاک مەولوودی خاوەن ماشێن بە ورەیە، زۆر جاران لەو کوێستانەڕا تێپەڕیوە، پەروای نییە. بۆ چایخانەی مچە کۆڵ، هەر بروکێکمان ماوە. کرێوە دەسمان لێ‌ئەوەشێنێ. بە نیو کاتژمێری دیکە لەوێ دادەبەزین. ئەگەر هەوا هەروا بێ ماوابێ، شەو با لەوێ وەمێنین، حیز و سلامەت، لە پێچی جادەکەوە زەلامێک دیارە. جاروبار هەڵدەستێ و دەڕوانێ و دادەنیشێتەوە. دوور نییە خراپەکار بێ.

زۆر جاران خەڵک لەوێ تووشی بەڵایان هاتوون. وێ‌دەچێ ئەو زەلامە قەرەوڵی ڕێگرەکان بێ و یلداشەکانی لە ژێر تاشەبەردان دا خۆیان حەشار دابێ.

ماشێنە بۆر، زۆر بە شێنەیی ڕۆیە پێش. زەلام دەستی هەڵێنا و سوار بوو. زەلامە لاوێ بوو جوان‌خاس، بێ‌قسە و مەند و ماقووڵ و قۆل هەڵکراو و وێچوو، وا دیار بوو، زۆر لە مێژە چاوەڕوانی ماشێنە و لەو شوێنە بە بێ ڕێ‌وشوێن ماوەتەوە، سەرماوسۆڵ کەتنی خۆی پێ‌کردبوو، ڕەش و شینی هەڵگێرابوو.

شەوگوردی لەشی هاڵۆزاندبوو، لاو لە غەریبە دەچوو. هەر دەتگوت لەو وڵاتە نەبینراوە. لە ڕۆڵەیەکی بە ڕەنگ و ڕوو دەچوو چ نەجێبزادان ڕۆڵەی لەوە بە ڕەنگ و ڕووتریان نەدیوە، خولا بە دای و بابی خۆی بێلێ بە ڕاستی مەتولفەیەکی بێ‌وێنەیە. لە سەر ڕوومەتی چەپی دیاردەیەک هەیە هەر دەڵێی نەزەرگەی شێخە سووری کرێوەیە، یاخوا خوای هەزار شێخە سووران، بیپارێزێ. وا دیارە حاسمان دەیەوێ دەستێک لە زەوی بوەشێنێ. هەور و

هەڵایان لە خۆ وەکۆ دەکا، بەفر و باکوت، کوتە کوت، شووشە پەنجەران دەکوتێ و دەیانەخشێنێ. پێش چاوی مەولوودی شۆفیر تاریک دەکا و دەیەوێ وەیشوومەیەک وەرازێنێ. دڵتەنگی و بێدەنگی موسافیرەکان شۆفیری هێنایە قسە و دڵ دانەوان.

برام مەترسن بۆ چایخانەی مچە کۆڵ هەر پێچ و خۆبادانێکمان ماوە. لەوێ پشوو دەدەین. ئەگەر هەوا هەر ئاوابێ، ئەوشۆ بۆی تەخت دەبین هەی لە براو نەکەوی چایخانەی مچەکۆڵ جاروبار دەکەوێتە بەر چاو، لە پڕ، ون دەبێتەوە. کرێوە چاڵە و چۆڵی جادەکەی دار ماڵ کردووە. ماشێنە بۆر نەخۆشی دەروونی برستی لێبڕیوە. زۆر بە کاوەخۆ بەرێوە دەڕوا. بەڵام بۆ پشووی نەجات و سانەوە هەر چاو لێکنانێکی ماوە، قاوەخانەی مچە کۆڵ پەسیوێکی کەم نییە.

لەو بن کێوانە وەک خێری خولایە. ماشێنە بۆر لە شێنەیی کەوت، ڕۆچوون و ڕاچوون لە کاری خست، کووژاوە و بە ئاژاوەی ئەسپاردین بە هەزار پاڵە و پەستە و پاڵپێوەنان مووی لێنەبزووت.

ئیتر بەرەو چایخانە، بوو بەکێ بڕکێ و کەس لە کەس، هەی لەوەی زووتر بگاتە چایخانەی مام مستەفا و سەرما تووشی ئازاری گەورەی نەکات. شۆفیر بەو ڕووداوە لە ڕوو چووە کەسی بە دەورەوە نەماوە.

ئەو لاوە غەریبە نەبێ دەروجیران و دۆستی نانی هەموو ڕۆیشتن، شۆفیر دڵتەنگە، بە لای لووتی دەڵێ کوڕە ناوت چییە؟

ــ عەزیز

ــ بۆ نەڕۆیشتووی.

ــ لەبەر تۆ.

جـاتۆ چیــت لە دەس دێ. لانــی کەم هــاودەنگتم، دەتــوانم لێــرە لای ماشێنەکە وەمێنم تا ئێوە چارێک دەکەن. عەزیز گیـان، چـاری چــی؟ نـازانی ئێرە چ شوێنێکە ، ساڵی چەن لاوچـاکی وەکـوو تـۆ و بـێچـارەی وەک مـن دەکاتە قوربانی وەژێر هەرسیان دەخـات. بەڵام بـۆ خـوا شـوکور جێگەکەمـان باشە. هەرەس‌گر نییە.

عەزیز: ئەی کەوا بوو بۆچی خۆت تێخست و تووشی ئەو رووشە هاتی.

شـۆفیر: کاری خوا هەروان، من و تۆ سەری تێبڕ ناکەین. کە من نەدەهاتم تۆ چیت بە سەر دەهات، بۆ ئەوە تۆ مـاوەیەکی تریش عەمـر بکەیـت. دەبـوو هەربێم، دەنا ئەورۆ ڕێگەی هاتن نەبوو.

عەزیز: دەی برام، فەرموو وەرە پشت فەرمـان، بە تەمـا خـولای. کلیلێکـی تری تێخە بەڵکوو هەڵبێ و ڕێ‌کەوین.

شۆفیر: نە برام زۆرم لێداوە فایدەی نییە ڕەنگە جێگەیەکم سووتاندبێ.

عەزیز: ئیجازەم دە با منیش دەستێکی تێوەردەم.

شـۆفیر: نە بـرام لـێم ڕوونە لەوەندیشــی دەکەی. هەر لێــی گەڕێ بـزانین چیمان بە سەر دێ.

عەزیز: برام تکات لێــدەکەم ئیـزنم بـدە بـا چـاوێکی لـێکەم و دەســتێکی تێوەردەم.

شۆفیر: دەی برام فەرموو بزانم چی لێدەزانی، وا بزانم هیچ؟

عەزیز، بە ناوی خوا و ڕەسووڵانەوە هەستا و ناودڵی ماشینی، مـوو بە مـوو تاقی کـردەوە. زۆر سـیم و میمـی پسـاند و بە شـوێنی تـرەوە گرێـی دانەوە. ڕۆیشتە سەر فەرمان کلیلی تێخست و ماشـێن هەڵبـوو. لە چـاڵ هـاتە دەرێ ڕاستەوڕێ وەڕێ کەوت.

شۆفیر بزەیەکی شیرینی هاتە لێوان و لێوی عەزیزی مـاچ کـردن. عەزیـز گیان ئەتۆ فریشتەی نەجاتی منـی. خـدری دەمـی لێقەومـانی موسـوڵمانانی. هەتا هەم لەبیرم ناچێ بەراستی جێگای هومێدی داماوانی.

عەزیز: نە برام بە ڕاستی تۆ خاڵی نەجاتی منی، تـو نەبـای مـن هەر لەبەر بادا دەمامەوە، خوا دەزانێ، چیم بە سەر دەهات.

شۆفیر بزەی لە سمێڵان دێ. ماشێن، دەنگی لە سەر خۆیە چـۆنی دەنـگ دەی هەروا دەڕوا. ڕەشەبا هەر دێ و هەڕەشەی بەهێـز دەبـێ، بەڵام چایخـانە نزیکە: ـــدەبێ ئەمن و تۆ وەمێنین، تا بەیانیش خوا خێرەومەندە. ماشێنە بـۆر لە دەرکی چایخانە، سەفەر بە خێری ڕاگەیاند و مچە کۆڵ بە سـەری ڕووتـی دەرپەڕی شۆفیری لە باوەش گرت. خوا شوکور زوو هاتی دەنـا هەر ئێسـتا بە نانی چەور و چای گەرمەوە دەگەیشتمی.

سێ بە سێ هەرسێک وەژوور کەوتن. شـەنگە نـزیلەکەی هەڵبـڕی، تێکـڕا گوتیـان مەولـوودە سـوور چـۆن هـاتی زۆرمـان خەم بـووی هەر ئێسـتا دەمانهەویست سۆراغت بگرین. تۆمان دەهێنا بەڵام دەسـتمان لە ماشـێنە بـۆر شتبوو.

شۆفیر: بە ڤینگەیەکەوە گوتی: دەستو خۆش باشــوو بەجێ‌هێشــتم هەزار دۆست و هاوسێ غەریبەیەکی هاوکار ناهێنێ. مچە چای بێنە لە بەخێرهـاتنی وشک و برینگ گەڕێ. زۆربەی دانیشتوانی چایخانە یەک دەنگ هاواریان کرد شەنگە شەنگە گیـان، نەزیـلەی ئەو ڕووداوەمـان بـۆ تەواو کە، تـا بـزانین ئەو بنەماڵە چییان بە سەر هات و کێیان ماوە.

شەنگە پیاوێکی بە دەم و دوو بوو. بۆ قسان دانەدەمـا. نەقـڵەکەی لە تەواو بوون بوو بەڵام لاوی غەریب لەوسەرێ‌ڕا دەهاتەوە نەقڵ و نـزیلەی شـەنگە لە بارەی وێرانی بنەماڵەی خۆیانەوە بوو. بەڵام پێشی خۆشبوو شـەنگە لە سـەری بروا و بیر و بڕوای کۆمەڵیشی بێتە دەست. شەنگە دوبارە دەستان لە ئەژنـۆی خۆ دەدا و فرمێسکان دەرێژێ دەڵێ: حەیف پیاوی پیاو تەمەنی کەمە زۆر زوو بە نامرادی سەر دەنێتەوە و جیهان بـۆ داڕۆغە و دز و تەشـقەڵەبازان. دەبێـتە ماستی مەییو. هەرچی بیانەوێ بەڕاشکاوی دەیکەن و دەی‌بێژن.

شەنگە تائێرە هاتووە دەڵێ: ئافەرین شێرەژن. ژنی بە غیرەت و شەرەف ئەو شێرەژنە یەک کاتژمێر شەڕی کرد. باش چاوەش تێداچوو، کوژرا. پۆلیســەکان ماڵیان ئاگر دا. یای زین هاتە حەسار، تەقەی کـرد پۆلیسـێک کـوژرا و یەک بریندارە. یای زین فیشەکی پێ‌نەماوە. ئـاور و چەقەدووکەڵ سـەنگی دەخـاتە سەر. دەیەوێ ڕاکـا بەڵام شـوغڵەمەی تفەنگەکـان مـۆڵەتی نـادەن و شـەهید دەکرێ مامەخـانی مێـردی دوو ڕۆژ بـوو دەسـگیر کرابـوو ئەگەر یـای‌زینـی خێزانی ئەو کوشتارەی لە میری نەکردبا، هیوا هەبوو مامەخان ڕزگار کرێت.

میری لەو بنەماڵە ترسی هەر هەبوو. دژایەتی میری بۆ ئەو بنەماڵە تازە نییە. باوکی مامەخان و باپیریشی، هەر لە بەندیخانەدا مردوون و شەهید کراون. نوور بە گۆڕەکەیاندا بباری.

ڕەنگە حوکوومەت ئەمجا وەحەسی لە هەرێمدا بنەماڵەی مامەخان بنەبڕاو بوون. بەڵێ هەر تاقە کوڕێکی هەبوو مامەخان لەگەڵ کچێک.

کاتی ڕووداوەکە لە قوتابخانە دەبن.

پۆلیس دەیەوێ دەسگیریان بکا، بەڵام لە پەنجەرەیەکەوە ڕادەکەن بەرەو بێشەی ڕووبارەکە، ئیتر ڕۆشن نییە چییان بە سەر هاتووە. دەڵێن هەردووکیان خۆیان تەسلیمی شەپۆلی ئەو ڕووبارە کردووە، ڕەنگە ئەوەش ڕاست نەبێ بەڵکوو دەمگوی شوێنەونکە بێ.

حوکوومەت لای وایە ئەو کوڕە ماوە. پارەیەکی زۆر و بۆری تەرخان کردووە بۆ ئەو دێڵەپیاوەی ئەو کوڕەی نیشان بدات. هەزار لیرەی زەرد و سوور، وێنەشی داوە بە دێڵەپیاوەکانی، نانی، نانی. من وێنەکەم دیوە، خاڵێکی ڕەشی لە سەر لاڕوومەتی چەپی، بۆتە نەخش و نەزەرگە.

هەموو کەس بەو وێنەیە دەیناسێتەوە. ڕەنگە من هەر بۆ ئەو کوڕە نەناڵێم. زۆر لاوی تریش دەگرێتەوە، لەو هەرێمەدا ڕووبەخاڵ زۆر و زەبەندەن. بۆ حوکوومەت فەرقی چییە. هەرچی سمێڵسوور بێ هەمزاغایە.

فەقێ عەزیز، بە قسەکانی شەنگە لە دوودڵی هاتە دەرێ، بڕیاری دا لە وڵاتی گەرمێن نەبێ و بەرەو ئێران وەرێکەوێ، بەڵام کێ دەناسێ لەوێ دەبێ کامە ئیش هەڵبژێرێ، چۆن ژیان بەڕێوە ببات. بۆی یەکلا نابێتەوە، دەڵێ چ

نییە ئاوماڵکە ئاخری لافاو بە لایەکی دا لای دەدات. هات و نەهات بە دەس خودایە پاش تەنگانە، فەرجانەیە. شەنگە ڕووداوەکە دوولا و سێ لا دەکاتەوە و دەڵێ ڕەنگە خۆ بە ئاودا دان درۆبێ لە بێشەکەدا خۆیان لە پۆلیس ون کردووە شەو بۆی دەرباز بوون.

تەنانەت دەڵێن شوانی مام سلێمان ئەو کوڕەی لە تەختە هەواری جافەکان دیوە هەر بۆیەش میری لە تاقیبی دایە و بەرپان زێران هەڵدەڕێژێ، بۆ ئەو کەسەی بی‌ناسێنێ. بێچارە فەقێ عەزیز، بۆنی شیری خاوی لە دەم دێ، ڕەنگە چ لە چی نەزانێ زۆر زوو لە داو کەوێ. ئەگەر خێرخوایەک بیناسێ خێری دەگا. بلێ لەو وڵاتە نەمێنێ بەڵکوو وەبەر دەستی ئەو نەحلەتییانە نەکەوێ.

هەموو زار و دەمێک بوونە تەڵەی تەقیو. چایخانە بێ‌مەتەق و دەمەتەقەیە. شەنگە دەڵێی داستانی ڕۆستەمی مازەندەران دەڵێ. خەڵک کڕ و مات تێی ڕاماوە. فەقێ عەزیز بە نەزیلەی شەنگە کەش‌تەنگە، ئاگری لێ‌هەڵکراوە، ڕەنگی لە ڕووان پەڕیوە نایەوێ خەڵک ڕوومەتی باش وەبەر چاو بێنێ، ماندووە دڵ کورکە فرمێسک هورووژمی بۆ دێنن دەیانەوێ بڕژێنە خوار و ڕاستی هەموو شتی لێ‌بڵێن. هاکا بابایەک کوتی ئەو لاوە غەریبە خاڵ لە ڕووە هەوە باشتر ئەوەیە، بە بۆنەی شڵەژاوی ڕێگەوە پەنا بۆ جێگە بەرێ. لە سەر ڕوومەتی چەپی سەر بکاتەوە و لە بەڵای خاڵداری خۆ بپارێزێ بەڵام، کوا خەو، کێ‌هە پشوو دان! بۆ فەقێ بە جێگەی خەو، خەیاڵ و خەون، هاتەران و پاتەران. بێ‌ماڵی، بێ‌هەواڵی، بێ سەرەدەرییە. فەقێ درێژ بوو ماندوویی کردە بیانوو.



خەم و خەیاڵ کردی بە تەلاشی ناوگێژاوی دەم خوڕینان، جارێک بن ئاو دەبێ و دەمێ وەدەر دەکەوێ. دەمێ لەنگەر دەگرێ و پشوو دەدا و لە کەشتی نەجات دەڕوانێ. خەڵکی ناو چایخانەکە هەموو ڕاکشاون بەڵام هێشتا باسی بنەماڵەی مامەخان تەواو نەبووە.

بە خەمەوە دەڵێن: مامەخان بەندییە و یای‌زین شەهید کراوە، ئازیزەی کچی بووە بە قوربانی ڕووبار، کوڕە مێرمنداڵەکەشی بێ‌سەر و شوێنە، ڕەنگە ئەویش نەمابێ. ئەگەر ماشبێ چی؟ دەبێ بە شوان و گاوانی بژی. شەنگە لە زۆر قسان هەڵدەداتێ دەڵێ: کوڕە وامەڵێ خوا بکا مابێ. بەرخی نێر هەر لە بن سەوەدا نابێ. هەر بمێنێ بێ‌ڕێ‌وشوێن ناژی ئەوانە حەسڵ‌زادەن یەک بە سەد و دە بە هەزارن.

بۆ هەڵدانەوە چرووزەیەک بەسە. پاش پاییز بەهارە و بە دووی تەنگانەوە فەرحانەیە. هەرمابێ خەڵک یارمەتی دەدا، دەی‌شارنەوە لە پۆلیس چەقەڵ و گورگان دەی‌پارێزن. بە مەزەبم سوێند، خەڵک ئەو لاوەیان خۆش دەوێ. میری، سەدان نووسراو و بڕیارنامەی لە چایخانە و کووچەی بەرچاودا بوون. لەمەڕ دەسگیری فەقێوە، دەیان مەقام و پلەی تەرخان کردبوو. بۆ بەیانی تاقێک لەو بڕیارانە بە ساخی نەمابوون هەموو شڕ و دڕ و پەتوور پەتوور لە خمخۆرک و گەناوان خرابوون.

ئەوە نیشانەی خۆشەویستی ئەو بنەماڵەیە، ڕاستە فەقێ منداڵە بۆ خەڵک نەناسراوە بەڵام گوتوویانە، «بێچووە قاز هەر لە هێلکە هاتە دەرێ مەلەوانە»، خەڵک لە میری تووڕەیە لە بیانوو دەگەڕێ، هەر بزانن ئەو کوڕە لە کوێیە،

پێیەوە هەڵدەستن دەبێتە قارەمانی نێو قارەمانان. فەقێ، گـوێی داوەتە قسـان. لە دڵی خۆیدا داوان دەپسێنێ و بەندان دەشکێنێ و بەنـدیيان دێنێـتە دەر و هەژاران ڕزگار دەکا و هەتیوان دەلاوێنێـتەوە. دایکـی شـەهید بـووە و بـاوکی بەندییە، قەیدی نیـیە. بەرخـی نێـر بـۆ سـەربڕینە، بەنـدیخانە لانەی پیـاوی ماقووڵە، مەتەرێزی بە شەڕەفانە. بەڵام ئازیزەی خوشـکم بـێ‌نەخش و نیشـان ڕۆیشت؛ بوو بە قوربانی ڕووبارێکی ڕووداوی کوتوپڕ و ناکاو.

فەقێ خوشکی بۆ تاوێکیش لەبەر چاو گوم نابێ هەر دەڵێی چاوی لێیەتـی کە جارێک شەپۆل قووتی دەدا و تفی دەکاتەوە، سەرەوبنی دەکا و جلـوبەرگی هەڵدەداتەوە. قژە درێژەکانی لەو پشتێنی لکە دەسـماڵی بە گێـژ و پەرچـانەوە دەهاڵێ، هاوار دەکا دەڵێ: فەقێ فەقێ! گیان فریام کەوە خنکـام، ئەی بـرا بـۆ کەنگێ، بۆ کەی، بۆ کەی، بۆ کەی.

فەقێ بەو خەیاڵەوە ئالاوە، بە ڕواڵەت لە سەر ڕوو خەوتووە بەڵام چ خەو؟

مچەی قاوەچی چاوێکی لێ‌ناترووکێنێ، داستانی فەقێی بێ‌مامۆستا، موتـالآ کردووە قاوەچی بەئەزموونە، چایخانەی بن کێو، دز و درۆزن، هەڵاتـوو گرتـوو، خاس و خراو، پیر و لاو، دەس‌کەرەوە و بـێ‌دەس، کەس‌دار و بـێکەس، ڕووی تێدەکا. ڕاست و درۆ، چاوڕاو، گوتراو و نەگوتراو هەمووی تێـدا دەگـوترێ. تـا ئێرە قاوەچی تێوە نەچووە. لە چ ڕووداوان ڕووی هەڵنەمـاڵیوە، باوەشـی بـۆ چ پەنادەرێک نەکردۆتەوە. بەڵام ئەوشۆ دەیەوێ لەو غەریبە وریا بێ.





پێی خۆشە دوای کەوێ، هەڵیپشکنێ، بەڵکوو فەقێ عەزیز بێ، ئەگەر هەو بێ، یارمەتی بدات لەگەڵی هەستێ، دەستی وەرگرێ، گرێ کوێرەکانی بۆ بترازێنێ.

قاوەچی دەیەوێ چاوێ بە خەو بسپێرێ و پێروو[1] هەڵاتن، هەستێ و چایی دەمکات. بەڵێ ڕادەکشێ بەڵام هێشتا خەیاڵ دەستی لێنەکێشاوەتەوە، لە سەر ئەو لاوە غەریبە، چەتری خۆی لێهەڵداوە، کەوتۆتە هەزارە و دەڵێی هەزار کێوە خەمی بەسەردا رووخاوە.

شەنگە قلیان بە دووی قلیاندا بادەدا و فتیان دەکا و ئاخان هەڵدەکێشێ، خەمان، بە خەمان رەش دەکاتەوە، لە داخی زاڵم و زۆردار و زەبەلاحان چاوان دەگلۆفێ و سمێڵان دەکرۆژێ، لە پڕ کوتی: چووزانم.

هێندێ کەس دەڵێن عەزیز و ئازیزە هەردووکیان ماون، خۆیان لە چۆم و گۆمان نەهاویشتووە، کورە پیاو چووزانێ چۆنە و دەبێ چ بکات؟ بە قسەی کێ بڕوای هەبێ و باوەڕ بکات. سێ ڕۆژ لەمەوبەر لە مینووبووسێکا گوێم لە سرتەی لاوێک و پیرە پیاوێکی بوو باسی عەزیز و ئازیزەیان بوو، باسەکە خۆماڵی و کەسانە بوو نەمتوانی خۆی تێوەردەم. بەڵام تێگەییم کە دەیانگوت خوا شوکور هەرکیان ماون: یەکێک لە ڕاکشاوەکان هەستا سەر قوون بە مۆنەوە مۆڕەیەکی لە شەنگە کرد بە ئیشارە وتی: وس، وس.

---

[1] پۆلە ئەستێرەی پارشێو.

ڕەنگە بۆ وەدەس‌هێنانی لیرە سوورەکانی حوکوومەت، وا هێندەی لە سەر دەڕۆی. دەزانی وەک سیخوڕێک، دەخوڕی و فرمێسکی تیمساح دەڕژێنی لە سەر ئەو قسانە ڕەنگە هەر دوو شەوی دی شەو و ڕۆژان تماشاکەی.

دەچییە پاڵ گۆڕبەگۆڕەکەی گۆرین. ئەو باش چاوەشەی مامەخان تۆپاندی، ئەو باسە بەس کە ئەگینا بە گۆڕی یای زینی شەهید، زمانت لە پشتی سەرەوە دەردەخەن. شەنگە فرمێسکێکی گەرمی هەڵوەراند.

دەم و لووتی هەستڕی و کڕ بوو، کەڕەی بۆ کردووە و خۆی ڕاێکشا چی تری لە سەر نەڕۆیشت.

فەقێ عەزیز دوو مانگ و حەقدە ڕۆژە، بە ڕۆژ و شەو شەوارەی کردووە. لای نەداوە، لای شوان و گاوان کوێرکە مووچان نیوە وچانێکی ئەگەر بۆدرابێ یا نەدرابێ، هەوەڵین شەویەتی کەوا لە نێو ئاپۆرەی خەڵکدا پشوو دەدات چاییخانەی مام مچە بۆ ئەو بوو بە چاک و پیر و پیرۆزی، هەواڵی خۆشی بیست. وا دیارە، ئازیزەی خوشکی زیندوو بێ.

فەقێ عەزیز بە ڕواڵەت خەوی لێکەوتووە، بەڵام هەموو ئەندامی بۆتە گوێ و وتەکانی مام شەنگە زۆربەیان مزگێنی گەورە بوون. وا دیارە ئازیزەی خۆشەویستم لە چۆم نەکەوتووە، بەڵام ڕۆشن نییە لە کوێیە، خوا بکا هەرمابێ. خەمم نییە. ڕۆژێک دەبێ جێگای بزانرێت. وا دیارە باوکیشم ڕەنگە بەندی نەبێ.

حەیف شەنگەیان لە خۆڕایی دەمکوت کرد ڕەنگە پیاوی باش بێ و وسکوت نەکرابا، زۆر شتی تری دەگوت. ناکرێ من هیچی لێ پرسیار بکەم

دەمناسێ، ئەو خاڵە لە من بۆتە بەڵا، ڕۆژێک ڕەنگە تووشی داو و تەڵەم بکـات. وا باشە. هەر بەیانی زوو لێرە بڕۆم. ئێـرە قەرەبـاڵخە، نـاکرێ وەمێـنم. میـری شوێنم هەڵگرێ دەڕناچم، چیم بە دەستەوە نییە. دەنا ترسم لە میـری کەمتـر دەبوو، چەکە شرەیەکیشم بایە هەرچا بوو.

تەنانەت گیرفانیشم دەیەوێ خاڵی بێ ڕەنگە دوا حیسابی مانەوەی ئەوشۆم دراوێکم پێنەمێنێ. ئەو جار هەر دەبێ بە پێیان بڕۆم پارەی ماشـێن سـواریم نامێنێ.

ئایش... کەی لام وابوو من ڕۆژێک دەبینم بێ پارە بم، ئاوا غەریب، یاسـاخ بێهاوڕێ، بێ سەرەدەر و بێ برا و باب.

داماوی قوون تەندوور و وڵاتی دوور بم. بە بەشی خوا شوکور خـۆم داوەتە دەس خوا، بزانین چ دەبێ؟ چیمان بە سەر دێنێ؟

چایخــانە هەر دەڵێــی لانەی خەم و پەژارەیە، هەمـــوو کەس بێـــدەنگە، قوڕوقەپی بازاڕی توندە. شـەوی ڕەش تێپەڕیـوە، سـوارەی بەرەبەیـان دەیەوێ دابەزێ و سەدان بەزمی تازەتر بتازێنێ.

کرێوە و باکوت کوتکی خـۆی وەشـاندووە. چـاوی پەنجێـرە و دەلاقەکـانی بەسـتوون. ناو هۆدەی چایخانە بێدەنگ و سەدایە. هەر سـرتەیەک دەبیسـترێ. ئەویش هی سەماوەرە زلەی مچە کۆڵە.

فەقـێ عەزیـز سـەرەڕای مانـدوویی بـێ سـەرەدەری خەو و خەونـووچکە هەرگیز نەبوون بە میـوانی، دڵـی لە خەم کلاورێـژە، خەیـاڵی پەرت و بـڵاوە.

لێکدانەوە و بیر و بۆچوونی چیبەچی نەکردووە. لە ڕۆژ دەترسێ. پێی خۆشە هەر شەو بێ ئەو خاڵەی ڕوومەتی بۆ ئەو بۆتە خەتی نەگبەتی.

نەزیلەی مام شەنگە بە هەموو کەسی نشان داوم. حاشام پێ ناکرێ. ناشێرینمەوە، وادیارە میری بە دوومەوە. هەرچی زووترە دەبێ بڕۆم سنوور ببڕم وڵاتی خۆم نیشتمانی باو و باپیرانم دەبێ بەجێبێڵم، خوا بکا هەوا خۆش بێ، نەبارێ، چ نەبێ لاڕێ دەڕۆم کێواوکێو دەبمە میوانی شوان و سەپان و وەرزێران.

تا کەس بەخەبەر نییە و وڵات بێسەر و سەدایە با چایخانە بەجێ بێڵم. لە ترسی خاڵ لە شوێنی قەرەباڵغ نەمێنمەوە. نزیلەی شەنگە، هەمووی ئامۆژگاری بوو بۆمن. ناکرێ خۆی لێ گێژ کەم.

بەڵام بۆ کوێ بەرەو کوێ، بۆ لای کێ، بەرەو کێهە هەرێم و کامە وڵات...

چ نەبێ، خۆ لە پۆلیس و سیخوڕ و قاچاخی ڕوومەتی بە خاڵ، خلاسیم دێ. لە ڕووم دێ، دێ بە دێ ڕوو نیشاندەم. پشوویەک بدەم. ئیشێک، کارێک، وەدۆزم. ماوەیەک خۆمی پێوە سەرگەرم کەم.

فەقێ عەزیز زۆر بە ئەسپایی دەرکی حەوشەی کردەوە، ڕۆیە دەر چاوێکی بەرەو حاسمان هەڵبڕی حاسمان ساماڵ و سیقاڵ دراوە. لە چلکە هەور و هەرەشەی ڕەشەبا شۆراوەتەوە. پەل و پۆی دار و دەوەنان، باریان قورسە و بەفر لووتی پێنەوی کردوون. دەم و لێوی کێوە سەربەرزەکان بە زەردەی هەتاوەوە خۆ دەنوێنن.




دەستی ڕاست تورکیایە ئەگەر دەسکێش و باڵتۆ و کورتەک و کوولەباڵ و کلێتەم هەبا و یارۆیەکی ناسیاو. لێزان، هەر ئەورۆکە ئاوای ئەودیو دەبووم.

مچە قاوەچی شەو زۆر بە کەمی خەوتووە، بیر و خەیاڵ لە سەر ئەو لاوە وەلانەکەوتووە. نەقڵ و حیکایەتی شەنگە بۆی لە بنی کوولەکە داوە، ئەو لاوە غەریبە ناوی عەزیزە هەر دەبێ هەمان فەقێ عەزیزی داستانەکەی شەنگە بێ.

هەی بێچارە چەن ساویلکە و بێئەزموونە تەنانەت ناوی خۆشی نەگۆڕیوە، ڕەنگە حاشاش بکات. بەڵام دەزانم بە زاراوەی شاربازێری دەدوێ. زۆر لە مێژە حاجی مامە خانی شاربازێری ناوی هەیە. بە قسەی شەنگەی زۆر بلێش، ڕووداو ڕوو دەکاتە هەرێمی شاربازێڕ.

مچەکۆڵی چایچی دوو قامکی دەستی، چەپی بڕاوەتەوە ئەویش قەدیم باب و باپیری شاربازێری بوون. لە شەڕێکی خۆبەخۆئیدا بە باوەشی دایکییەوە گوللەی وە دەستی کەوتووە خۆی بە بیری نایە بەڵام ئەوەندە دەزانێ باوکی لە دەس ئاژاوەی ناوخۆ و دژایەتی هەرێمی پەرپوەی ئەو وڵاتە بووە، لەو بن کێوەدا کەپرووکێکی پێکەوە ناوە کردوویە بە چایخانە و خانە و لانەی لێ‌ساز کردووە. چایچی کچێک و کوڕێکی هەیە، بە ناوی ئازاد و ئارەزوو. خێزانی لە تیرەی هەمەوەندانە و خەڵکی گەرمێنانی خواروون، ئەو ژنە ناوی ناز خانمە و بە ڕاستی خانمیشە لە باشیدا تاریف ناکرێ، لە دوکتۆریدا سەری باش دەردەچێ، بەو هۆیەوە لە زۆربەی هەرێمەکەدا بە ودم و فەڕو دەست و مەچەک جوان ناسراوە.

شەل و شکاو، بریندار و مارانگەز زۆری پێوەندەی پێوە دەکەن و پەنای بۆ دەبەن. هۆدەیەکی تایبەتی، نەخۆش و سەرئێشانی هەیە. لەو بنار و دوورە شارەدا نیوە حەکیمێکی تەواوە. سفرە و نان و خوانی، زیاتر خاتری خوایە. ئەگەر هەقی دەوا و دەرمانیش وەرگرێ ڕەنگە خەرجەکەی بۆ پڕ نەکاتەوە.

مچە قاوەچی لە چوونە دەری فەقێ، ئاگادار بوو. ویستی پاش گەڕانەوەی سەرکێکی لەگەڵ بکات. ئەگەر موویەکی بۆ لەو ماستە ڕاکێشرا، بڕیاری پارمەتی باشی دەداتێ. ئەگەر متمانەی پێنەکرا وەباڵی خۆی بە ئەستۆی خۆی. فەقێ زۆری پێچوو نەگەڕاوە، قاوەچی کەوتە دڵەکوتە گوتی: لێرە و لەوێ هەڵنەپرژێ و ئێمەش تووشی سەدان دەردیسەری ببین. قاوەچی وەدووی دەکەوێ. عەزیز لە حەساری قاوەخانەیە. هەر لێرە و لەوێ هەڵدەڕوانێ، ڕەنگی بەروانەوە نەماوە دەڵێی خێو خوویان لێکردووە.

چایچی: سڵاو، ڕۆژباش،

عەزیز: چووکەتم، ژیان باش گەورەم.

چایچی: کوڕم، بەو سەرمایە لەچی دەڕوانی.

عەزیز: هەر ڕوانینم پێماوە ئەویش بۆ ماوەیەکی کەم.

قاوەچی: دەی فەرموو نیازت چییە.

عەزیز: نیازم، نازی لێونە و لەو دەڕوانم.

قاوەچی: کوڕم بەچاوە نەبی لاوێکی زرینگی.

عەزیز: بەڵێ گەورەم هەر زرینگی لاوان دەخاتە دینگی کلۆڵییەوە.

قاوەچی: کوڕم بۆچی وا ناهومێدی؟ خۆ کوڕی کورد ناهومێدی ناناسێ.




عەزیز: بەڵێ گەورەم، گەر بزانی چۆن لە دوشمنی ڕاسی.[١]

قاوەچی: کوڕم بێخەم بە، پاش ڕەشە شەو، تاوهەڵاتە.

عەزیز: بەڵێ ئاغام کە لە شەودا، شەوە نەتباتەوە.

قاوەچی: فەرموو بۆ حەساری ژووری، نە چایخانە.

عەزیز: نا گەورەم نامەوێ تووشی ژانەسەرت بکەم.

قاوەچی: کوڕم، تماشاکە سەرم هەر بە ژانە سەران بۆتە تاسی حەمامی.

عەزیز: دەمەوێ بڵێم لەو نزیکانە کامە شار و دێ نزیکترن.

قاوەچی: کوڕم بۆ ئەو پرسیارە هێشتا زۆر زووە فەرموو بۆ ژووری.

عەزیز: نانا گەورەم، نامەوێ سەربار بم.

قاوەچی: فەرموو دەستاوی خۆمە منیش سەرباری خەڵک زۆر بووم.

عەزیز گوێی لە دەنگی دایکی بوو، داخورپا، پڕ بە حەسارەکە قیژاندی. دایە دایە، دایە، تۆ بۆ لێرەی. بۆ، بۆ، تۆ ماوی شەهید نەبووی. بەدەم ئەم خورپە و زیرەوە فەقێ کەوتە زەوی، بەو سەرمایە ئارەقە لە سەر خاڵە جوانەکەی لاجانگی، کەوتە سەما، لێوەکانی سپی بوونەوە. دەنگی دڵی بە گوێی سووک نەبێ نەدەبیسرا.

قاوەچی بێ مەترسی دەرکی حەساری ژوورەکەی کردەوە عەزیزی بە بێ حاڵی، ڕاکێشا و بە خێزانی گوت ئەتۆ قسەی لەگەڵ مەکە.

لێی گەڕێ تا دێتەوە سەرحاڵ، ئارەزوو بە دەمیەوە بێ. خۆشم دەچمە چایخانە. کارەکانی دەدەمەوە دەس دۆستێک. ئەو لاوە لێرە دەمێنێتەوە.

---

١ وتەی مامۆستا هەژارە.

موسافیر نییە، تەرەکەمە و ساویلکەیە، دەبێ ئامۆژگاری بکەین. نازانم چی‌بوو هەر کە تۆ دەنگت هات، گەشکە بوو هاواری کرد. دایە دایە، تۆ بۆ لێرەی، شەهید نەبووی! ئیتر پێ‌ڕاهات. خوا بکا تووشی، تووشی خورپە نەبووبێ. ئەوی دی مەسەلەیەک نییە.

قاوەچی ڕۆیشتەوە قاوەخانە میوان هەموو هەستاون ماتڵی نان و چایین. هەموو لە فەقێ عەزیزیان پرسی. گوتیان: چی لێ‌هات و لە کوێیە.

قاوەچی دەڵێ: لاوێکی شەرمێونە دوور لە ڕووتان کاری حەمامی هەبوو. منیش هەر لە سەر پووڵی خۆمم. حەمامم بۆ گەرم کردووە خەریکی خۆشتنە.

زۆربەیان گوتیان: پووڵ و خەرجی ئەو لاوە بە گەردنی ئێمەیە. بە ڕاستی پیاوێکی مەند و ماقووڵە و قسەزانە. خۆزگە بمان‌زانیبا کوڕی کێیە. قاوەچی زەردەیەکی دزێوی هاویتە لێوان گوتی: چووکەتان کوڕی منە، عەسکەری ڕاکردووە.

مەولوودە سووری شۆفیر گوتی: ئەی بۆ ئەوشۆ خۆت نەکرد بە ساحەبی لە چایخانە نوواندت. قاوەچی هەر هەویستم شتەکە لە ئێوە گوم بێت بە ڕووداوەکە نەزانن. بەڵام بۆم ڕوون بوو کە مەسەلەکە گەورەتر لەوەیە بە تۆپە قوڕ وەی‌شارین، لە مەعەسکەری ئەسحابە سپی لە ناو خۆدا. تەقەولێکدانێک بووە گوژاو و زامدار زۆرن. تیرەی یەزیدییەکان بۆ کەیخوایی خۆیان تێوەداوە. لە لایەن میرییەوە تاوانبار کراون، زۆریان گیراون و عەسکەرە کوردەکان چی لەوێدا بوون ڕایان کردووە. ئەو نۆکەرەی ئێوەش لە ڕاکردووانە. ناوی خۆی ناوە عەزیز بۆ ئەوەی بە ناوی ڕاکردوویەک نەناسرێ.

کاکە شەنگە: بەڵێ کاک مستەفا، ئەوە دوو حەفتەیە ئەو هەواڵە هەیە شەو ویستم ئەو دەنگۆیە و برێک ڕووداوی تریشتان بۆ وەگێرم، بەڵام مام قادر «قالە باوەجانی» بێهۆ دەمکوتی کردم.

هەر خۆی بە نامووس دەزانێ، خەڵکی تری پێ بەڵمەبرینجە. کورە باوەجانی مەگەر بە زاکوون بوون. خەڵک بە بەرەی باوەجانییەکانەوە فێری ترسەنۆکی بوون.

قاوەچی: کاک شەنگە ببوورە وەختی دەمەتەقە نییە نەیناسیوی دەنا تۆ پەرێزت بێدالدە و درەو و دالە.

من کارم زۆر بە تۆیە دەبێ لە مانگی داهاتوودا سەرێکم لێهەڵێنەوە حاڵی بووی تێدەگەی دەڵێم چی!؟

بەڵێ ئەگەر خوا ئیزنی لە سەر بێ پاش گەڕانەوەم لە زیارەتی ماڵی خوا ئەگەر من بۆم نەکرا تۆ سەرێکم لێهەڵێنە بە تەمای دیدار، بە تەمای خوا، خواحافیز، خواتان لەگەڵ.

نازخانم خێزانی مام مستەفا:

نازخانم، خانمێکی وەیچووە لە هەموو شت حاڵی و بە تەجرەبە و ئەزموونە، تەمەنی بەرەو چل ساڵی دەڕوانێ.

ئەویش لە ڕووداواندا تواوەیە، دایکی خەڵکی شاربازێرە و باوکیشی لە هۆزی هەمەوەندە لە بەر و پشتە و، نەجیبزادەیە. کاک مستەفای مێردی لە بنەماڵەی بابانەکانە، ژیانیش بێبەرووپشتە، پشتی زۆر کەسی لە زەوی داوە. دژایەتی و دووبەرەکی ناوخۆ پێدەشتی پێ بەجێهێشتوون و لە هەرێمێکی

شاخاویدا کردوونی بە قاوەچی. نازخانم دوو برای لە هەرا هەرای دووبەرەکیدا لە دەس داون. ڕووناکی تاریکە شەوی، ژینی کوڕ و کچێکی گەنج و لاوخاسن. ئازاد و ئازەزوو. ئازاد هێشتا عەسکەری تەواو نەکردووە پاش شەش مانگ و حەفدە ڕۆژی دی دەبێ بەرەومال وەگەڕێ، نازخانم گەرم چاو لە ڕێگایە، بەڵام ئەو ماوەیە بۆ چاوەڕوانی کەم نییە. ئەویش بۆ چاوە چاوی دایک، دایکێکی تەرە و لە تیرە و ڕەگەزی خۆ دوور و هەڵبڕاو.

نازخانم بە دیتنی ئەو لاوە غەریبە، غوربەتی، زیاتر ئازاری دەدا و برینی کۆنی پتر دێنەوە سوێ. خەم و خەیاڵ و پەژارە، چیتر هێرشی دەکەنە سەر و فرمێسکی پێدادەبارێنن.

ناز لای وایە ئەو لاوەش هەر وەکوو زۆربەی لاوانی وڵاتەکەی تەلاشی دەم خوڕینی ڕووداوێکە.

خوای گەورە بە دای و بابی خۆی بێلێ، چ مەتوولفەیەکی زەریف و سپی و سۆڵە، هەر دەڵێی بیجادەیە و سەدەف هەڵیهێناوە. زۆر شێوە و شوێنەواری دەچنەوە سەر سوارەی برام، ئەگەر ئەو خاڵە جوانەی ڕوومەتی نەبا دەمگوت بێ و نەبێ لە تایفەی خۆمانە.

ڕەنگە هەر واش بێ. تازە وا دێتەوە بیرم تایفەی دایکم زۆریان بە خاڵ بوون. تەنانەت بە بنەماڵەی خاڵداران دەناسران.

ئێستە بێگومانم لەوە ئەو لاوە ڕیشەیەکی دێتەوە سەر بنەماڵەی ئێمە، ئەی خۆزگە زووتر دەهاتەوە سەرحاڵ و خۆی بە ئێمە دەناساند مستەفا، ڕەنگە بیناسی، هەر بۆیەش ڕێگەی داوە بێتە دیوی ئەم دیو. بەڵام هۆی چییە

ڕێگەی بە من نەداوە داو و دەرمانێکی بۆ بە کار بێنم. تەنانەت گوتی: نابێ هەرگیز دەنگی تۆی بێتە بن گوێیان. چۆنی دڵ هات بە ئارەزووی کچمی بسپێرێ خۆ ئارەزووِ لە نەخۆش و مەخۆشان چ نازانێ. ئەویش کچۆڵەیەکی ساویلکە و بێئازموون تا ئێرە لاوێکی ئاوا دڵگر و گورچووبری نەدیوە ئەوەشم زۆر بە لاوە سەیرە، تا ئێرە مستەفا قەدەغە و قورغی بۆ من دانەناوە.

لە بەرچی، بۆ گوتی تۆ نابێ ئەو لاوە وەلاوێنی؟ نابێ هەرگیز دەنگی تۆی بێتە گوێیان. سەرم لەو باسە ماسیوە. ماست و مووم لێی تێکەڵاوە. لێکدانەوەم لەو بارەوە بێ دان و پۆیە. چی تێناگەم.

ناز خانم لەوبارەوە خەیاڵی سەنگی لە سەر داناوە لێرە و لەوێ دەدا و مستەفای لێ ناخۆشەویست دەکا. مستەفا ڕەنگە لە من دڵپیس بووبێ، دەنا چۆن ڕێگەی نەخۆشان لە من قەدەغە دەکات.

دەرگا کرایەوە مستەفا هاتە ژوور. نازخانمی زۆر بە شێواوی وەبەرچاو هات.

مستەفا: سەلام نازخانم ، ڕۆژباش بمبوورە ئەوڕۆ چایخانە شلووق بوو.

نازخانم: ژیانت باش، خۆشەویستم، منیش ئەوڕۆ شلووقتر لە چایخانەم.

مستەفا: تێدەگەم لەچی دڵت هاڵۆزە عەزیزم، دوایی تێدەگەی هەق بە منە.

نازخانم: یاخوا وابێت و من بە هەڵە چووبم.

مستەفا: لە میوانە غەریبەکە چ خەبەر.

نازخانم: دیداری لە من قەدەغەیە، چ هەواڵێکیشم نییە.

مستەفا: باش حاڵی نەبووی نەمگوت مەیبینە، گوتم نابێ دەنگت ببیستێ.

نازخانم: شەل نییە، پای شکاوە، دیداری بێ‌وتار سوودی چییە؟

مستەفا: نە عەزیزم، وا دیارە ئەو لاوە دایکی شەهید بووە. بۆخۆشی تەرە و ئاوارەیە. دوور نییە دەنگی تۆ لەگەڵ دەنگی دایکــی جیــاوازی ئەوتــۆی نەبــێ، هەر بۆیەش کە گوێی لە دەنگی تۆ بوو. گوتی دایە دایە، تۆ ماوی.

ئیدی پێداهات و لە سەر خۆ چــوو دوبــارەش لە ســەر ئەو بــاوەڕەم دەبــێ دەنگی تۆ نەبیستێ، هەتا تۆزێک، تۆزی ترس و نامۆیی لــێ دەتەکــێ، خــۆ بە ئێمە دەناسێنێ وا باشە ئێوە زۆر بێدەنگ ئامۆژگاری لێ‌بکەن. نەوەک تووشی نەخۆشی خورپە و ڕاچڵەکین بێ. بۆ هەمیشە بە ئارەزووە ژیان بەرێتە سەر.

نازخانم: مستەفا بمبوورە، مــن لە هەڵە دام. تــۆ لە هەڵە و پەلە و قەســتی چەوت و چەوێڵ دووری، بە ڕوحمی، داماو خۆشەویستی، دەس لە بــن بــاڵی، داماوانی.

دە هەستە با بچینە لای. بڕیار بێ هەست و خوســتم لــێ نەیە و کــڕ بــم بەڵام دا و دەرمانی پێویستی بۆ بە کار دێنم، مەگەر خــوا نەیکــا، دەنــا زووتــر دەیخەمەوە حاڵ.

ناز و مستەفا بەرەو هۆدەی فەقێ عەزیز وەڕێ‌کەوتن.

ناز جەنتایەکی دەوا و دەرمانی دەس‌سازی خۆی پێیە، نەخــۆش بــووراوەیە لە ئارەقەدا هەر شڵپەیەتی.

ئارەزووی کچیــان لە ژوور ســەریەتی. ڕەنگــی برووســکاوە. هەمــوو گیــانی دەڵێی بێ‌گیانە، لە عەبەساو دەچێ، دەڵێــی هەنگــاوە. دەم و لێــو و ڕوومەتــی سوور هەڵگەڕاون، سوور دیارە ئەویش حاڵی باش لە سەر خۆ نییە. دڵەکــوتەی




چۆتە سەرێ، زۆر باش وەڵام ناداتەوە. باوکی لەمەڕ نەخۆشـەکەوە، چـی لێـی دەپرسێ، لەتولووش و کاڵوکرچ، وەڵامی دەداتەوە.

ئارەزوو دەڵێ: ئەوشۆ کەم خەوتووم. خەمـی ئەو لاوەشـم سـەربارە. بـاوکی دەڵێ نەخەوتن چ نییە چارە دەکرێ. بەڵام خەمی لاوێکی ئـاوا، ڕەنـگە دووره چارە بێت، ئارەزوو بە دەس خۆی نەبوو گریان و فرمێسک دەیـانەوێ، ڕاسـتی لێبڵێن و نهێنی هەناوی بدرکێنن. سەردەمەی شەرمی کچانەی لێبدرێنن.

باوکی ئـارەزوو، لە مەسـەلان زوو تێـدەگا و لە دەردی دڵان ئاگـایە دەڵـێ کچم نارەحەت مەبە، پاشی تەنگانە فەرحانەیە.

ئەو لاوەمان بۆ بێتەوە سەر خۆ، ڕەنگە لە خۆمان بێت. لە خۆشـمان نەبـێ ڕەنگە بۆ هەمیشە لە یەک نەبڕین. ئارەزوو بە قسەکانی باوکی ئەوکـی بەربـوو. گەشەی تێگەڕا و گوتی: - باوە گیان جوانمێری ئێوە گەورەترە لە دەسـەڵاتی مێرانە. لە ژێر چاوەدێری تۆدا بە هومێدم چاولەدەس نەبین.

ناز خانم نایەوێ بدوێ، بەڵام پەستا پەستا، هەناسـەی دەسـتی دەداتـێ و ناوچاوان و دەمولووتی بە جەوهەری مێخەک و چەوری (چەوریـن و جـاتر) و گەڵێ گیا و گوڵی بۆنخۆش دەسوێتەوە و بەرگی بیژان، گەڵای گیا تـوڵەکەی لەبەر کەپۆیدا دەسووتێنێ و دەنەی پشمینی دەداتێ و دێتەوە سەر حاڵ.

فەقێ عەزیز، بۆ هەوڵین جارە لە سەر خۆ دەچێ بۆ هەوڵین جارە تووشـی سەفەری دەربەدەری دەبێ، بۆ هەوڵین جارە لە ناز دەبڕێ.

فەقێ عەزیز خۆی لە جێوبانێکی نەرمی خۆماڵییانەدا دەبینێ، هەروەکوو خەونێک دەچێ سێ نەفەر لە دەوری چاو بە فرمێسک و دەم بە دوعا و دڵ بە خەم دانیشتوون. نەخشی خوشک و دای و باب بازی دەکەن.

عەزیز تاساو و عەبەساو بە ئارەقەی نەخۆشی و جواناوی شەرمەوە ئەو عەزیزە نەماوە هەر دەڵێی لە قەبران گەڕاوەتەوە.

یارای هەستان و هەڕەکەی وەڵام و ورتەی لە دەس داوە، سەری دەخولێ و گوێی دەزرینگێتەوە. چاوەکانی لە چاوە چاو دەڵێی مانیان گرتووە، جار و بارە ئاونگی خەم دەیانهەنگێوێ.

نازخانم نایەوێ بە دەنگ بیدوێنێ بەڵام بە گیان و دڵ دەستی لە سەر دڵی داناوە، هێواش، هێواش دڵی دادەماڵێ، پەنامەکی فرمێسکان هەڵدەوەرێنێ، ئارەزوو بێمتەقە چاوێک لە فەقێ ناترووکێنێ. کوتە کوتی دڵی چۆتە سەرێ، ڕەنگی سوور هەڵگەڕاوە.

بۆ هەوەڵین جارە دڵ دەسەڵاتی لێدەستێنێ، دوور نییە بزۆزی ئەوین بەزەیی پێدانەیە، هەیە و نییەی حەیای لێوەبەر بادا و لە پڕ مێزی تێوەرێنێ، بڵێ عەزیز، عەزیزی من، فریشتەی خەون و خەیاڵی من. ئەتۆ، ئەتۆ، نابێ بمری، نابێ لای من بڕۆی، ناتوانی بەجێم بێڵی، عەزیز، عەزیز خەونی بەدی هاتووم، بازی ئاوارەی، کەوی نەکراوم سێ ساڵە سێ ساڵی ڕەبەقە من چلەت بۆ دەکێشم نەزر و مەولوودیم بۆ لە خۆ گرتووی.

دەس بە داوێنی خەونامە و دوعا و نزایان بووم. عەزیز گیان بە گیانی عەزیزت بە ئاوری هەڵگڕاوی دەروونی کچانەم، بە ژیلەمۆی دانەمرکاوی سێ

ساڵ چاوەڕوانیم سوێندت بۆ دەخۆم کە لە مێژە من تۆ دەناسم. تۆ ئەو ڕاوچییەی منت لە هەژدیها خلاسی دا. هەر ئەو فریشتەیەی لە هاوارم هاتی، لە حەزیەت نەجات دِام گیانێکی نوێی ترت پێبەخشیم، بەڵام ئەی کوێنم دەبەر. ئاخری خەوەکەم چیی؟ دایکم بۆ وەبەر خەنجەری دای. بە جێگەی سوپاس لە تۆ.

بۆچی لە سەر چی قەستی کوشتنی لە تۆ دەکرد؟

ناز خانم، دەستی لە سەر دڵی فەقێیە، بەڵام بە چاو خەریکی موتاڵای خەیاڵی برووسکاوی ئارەزووی کچییەتی.

ناز خانم بە تەواوی دەراوی هەناوی ئارەزووی شڵەقاندووە، چی تێدا گومە دۆزیویەتەوە، میراتی دایکان خەڵاتی کچانە.

ناز خانم هەرەتی کچانەی خۆی هاتەوە بیر، ئەودەمەی کە چاوی بە مستەفای باوکی ئارەزوو کەوت. هاتەوە بیری کە ئەوین چی بە سەر هێنا چ شینێکی پێڕشتووە.

ناز خانم هەنگاوتوویە کە ئارەزوو چۆن هەنگێوراوە و خەیاڵی چ دەورێک دەگێڕێ. ناز نایەوێ مستەفا بەو ڕازە بزانێ، دەیەوێ بە ئارەزوو بڵێ لای عەزیز بەجێ بێڵێ، بڕواتەوە ئەو دیو نان و چایی، ناشتا ئامادە کات. بەڵکوو باوکی بە ئەوکی پڕ لە داوای نەزانێ ئارەزووی کچانەی نەخوێنێتەوە.

بەڵام ئارەزوو نایەوێ ئەوێ بەجێ بێڵێ. نایەوێ چیتر بە فەرمانی فەرمانبەران، لە دەر و ژوور دابێ. لێرە بەولاوە کچی کەس نییە، کچی ئەوینە فەرمانبەری دڵە. نابێ دڵی پاشای ئەوینی بشکێنێ، دەیەوێ لەو لاوە

غەریبە پەزیرایی بکا و دەردی نەدرکاوی، بدرکێنێ. خەونی سێ ساڵەی بۆوەگێڕێ، ئارەزوو نایەوێ ئەو لاوە هەروا زوو بە زوو بێتەوە حاڵ، بۆی ڕۆشنە بێتەوە حاڵ دەکەوێتە باڵ. ڕێبوارە و ڕێگای خۆی دەگرێ. چ دەربەستە لە کوێ دەمرێ و کێ بۆی دەمرێ، تا بێ‌پێ بێ هەستی ئارەزوو باشتر پێ دەگرێ. چ نەبێ دەتوانێ وەک ئامۆژگارێک پەنجەی بگوشێ و ئامێزی تێوەرێنێ، ئاوری بزۆزی کچانەی کەم و کورتێ دامرکێنێ.

ناز خانم ڕوو بە مستەفای مێردی دەڵێ بۆ خوا سوپاس دڵی هاتۆتەوە حاڵ. لام وایە خەوە، نە بێهۆشی. خوا دەزانێ چەن ڕۆژە بەرێوەیە، ڕەنگە بێ‌خەوی سەری لێ‌سەندبێ. ئەو لاوە چ لە ڕێبواری ئاسایی ناچێ. یا خوا دوور بێ قاچاخ و قوچاخ نەبێ، خەڵکی تریشی پێوە نەگلێ. مستەفا و ناز هۆدەی نەخۆش بەجێ دێڵن، ئارەزووی بە ئارەزووی خۆی دەسپێرن.

مستەفا داستانی شەنگە و نەقڵ و بەسەرهاتی بنەماڵەی مامەخانی شارباژێری بۆ نازخانم خێزانی دەگێڕێتەوە. نازخانم دایکی شارباژێرییە و لە بنەماڵەی باوەخانی مەزنە. باوەخان و مامەخان هەر بنەماڵەیەکن.

مامەخان ئامۆزای باوەخانی جافە، باوەخان باپیرەی دایکمە ئەگەر ئەو لاوە لەو بنەماڵە بێت، بڕبڕەی پشتی منە، مستەفا دەستی من وَ داوێنی تۆ، تۆ و غیرەت و هێزی جوانمێریت. بیکە سەدەقە سەری ئازادی کوڕت، هەستە بەرەو شارباژێر بەرەو شارۆکەی قەرەچوالان وەرێ کەوە. هەواڵێک لە ماڵی مامەخان وەرگرە مستەفا تۆ نەچی دەبێ خۆم بچم. دەنا ناژیم ئەو هەواڵە تووشی سەدان ئازارم دەکا و لە کەڵکم دەخات، سەد ساڵ چەک تاوێ گەرک.

مستەفا دەڵێ مشووری ئەو کارەم خـواردووە ڕەنـگە بەو زووانە هەواڵـم بـۆ بێتەوە، ناز گیان من گیانم بە نازی تۆ دەنـازێ. تـۆ نەبـی مـن چ نـیم مـچە کـۆڵێکی کـۆڵەوارم لە ڕەگەزی بابـانم. بـێ دای و بـابم. مـن گیـان و مـاڵ و نیشتمانم بە تۆ بەخشی. تۆ ئەستێرەی بەختەوەری منی. سـەرم لە ژێـر پێـی داواتە، دەستووری تۆ مۆرەی ئـایینی مـنە. چـی تـۆ بیڵێـی بە لامەوە ڕەوایە. ئەوینی مـن نیسـبەت بە تـۆ هەر دەڵێـی تـازە پێدەگـرێ. خـرەکە دەبـێ و هەڵدەفڕێ. لە چیای جوانی تۆدا خەریکی، هێلانە دۆزیـنەوەیە. ئەرخەیـان بە، هێشتا لە تماشات، لە خۆشەویستی و ئەویندارییت تێر نەبووم. مرووم نەشکاوە، ئەو ڕۆژەی کە تۆم دی تۆم ناسی، بەڵێنیم پێدای، بەو ڕۆژە سوێند بەو کـاتە قەسەم هێشتا خۆشترم دەوێی.

زیاتر حەزم لێتە. ناز گیان! نازی تۆ نیازی منە، چـی دەسـتووری تـۆیە بە ڕووسـووری خـۆمی دەزانـم. بـۆ مـن سـوور و ڕۆشـنە ئەو لاوە نیسـبەتی بە بنەماڵەی خالۆانی ئێـوەوە هەیە. هەر بۆیەشـم وەرگرتـووە. دەمەوێ یـارمەتیی بکەم. تا ئەو شوێنەی هێزم هەیە وەشـوێنی کەوم، تـا ئەو پـلەی تـۆ دەتەوێ خۆشەویستی خۆم دەرحەق بە تۆ نیشان بدەم.

ناز خانم: مستەفا گیان، چی تـرم مەکـووژە بەسـمە لەوە زیـاتر بە ئـاگری جوانمێریت، دڵسۆزیت و خۆشەویستیت، مەمسووتێنە. نازانم بە چ زمانێـک بە چ زار و دەمێک سوپاسی تۆ بدرکێنم. ڕایگەیێنم کە تۆ فریشـتەی خێرخـوای پاکی، خاوێنی، هەوێنی جوانمێری، نەترساوی، شێری، دیـرهەم و دراو، بـای

نەداوی. چڵە و چڵپە و نەوسنی، نەیگۆڕیوی، نەجیبزادەی، ڕەسەنی نەدۆڕاوی لە بنەماڵەی بابانی، نەگۆڕاوی.

بەو ڕۆژە سوێند کە سوێندم بۆ خواردی بەو دەمە قەسەم کە بۆ دەمێک دەمم لە دەمی تۆدا هەستی خۆشەویستی کرد و بەرهەمی ئەوینی تۆم چەشت. ئەوەتی هەم لە خۆشەویستی تۆ تامەزرۆم نەشکاوە.

کە تاوێ، ناتبینم هەر دەڵێی نەبینم، لە نزیکی تۆدا ساڵ و مانگم بە کات و ساتێ لە سەر تێدەپەڕێ. من لە عیشقی تۆدا تێواوەم، تولا، تولام و داپڵۆخاوم. تۆ شیاوی ئەوەی کە سەدی وەکوو من کەنیز و قەرەواش و نازکێشت بێ. من لە هەڵەدام، جاروبارە دەمەوێ لە بڕێک کاروباران هەڵدەمێ نەخشی نەخشین بدرکێنم. ئەوی ڕاستی بێ دەمەوێ لە خەونەکەی سێ ساڵ لەمەوبەری ئارەزووی کچمان بدوێین، بەڵام بمبوورە خەون و خەونووچکە چ نییە، بۆ ئەوەی نابێ دەست و دڵ و خەیاڵی بە دوودا ماندوو کەی، هەموو شت بە خولایە. خەون و مەون نە جێگەی خەمە و نە جێگەی هیوایە. هەر وەبیر نەخرێتەوە باشە.

مستەفا: نانا عەزیزم، ئەوە مەڵێ خەون لە لایەن خواوە دێ.

خەون خەڵاتی ڕۆحی پاک و خاوێنە، خەون میراتی پێغەمبەرانە، ئیلهامی بەرزی ئاسمانییە، خەونی ئارەزووی کچم هەر لە بیرە لام وایە بە سوودی ئارەزوو ڕووداوێک دێتە گۆڕێ، لام وایە ئەو لاوە هەر هەمان ڕێبوارە هەمان ڕاوچییە کە بە خەو دیتوویەتی، ئارەزوو لە ڕەنگ و ڕووی خەیاڵی لە جووڵانەوەی دەردەکەوێ کە گوم بووی خۆی، ڕاوچی خۆی دیوەتەوە. خەونی

خۆی هاتۆتە دی، تامیلای پێویست نییە، ئەو قسەی کە کرا لە بارەی کوڕی حەمەخانەوە، ئارەزوو بە دڵی نەبوو، منیش نەمویست دڵی تۆ بشکێنم دەنا ئەو تایفە منەتکێشن. نانی نانی و خوازەلۆکن، گوڵەبەڕۆژە و ڕوو لە ڕۆژن، نۆکەری شۆربا و پیاوی پلاو و گۆشتن. هۆزێکی زۆر و بۆر و سەرگوێ شۆڕن. نان‌ناس و خوانەناسن.

- من نامەوێ لەگەڵیان تێکەڵ بم، دڵی تۆم ویست دەنا دەم و دەس دەمم دەبەستن. ئێستاش نەچووە بچێ ئیزنی تۆی لە سەر بێ، بێ‌ئەوەی لۆمەمان بێتە سەری، سەرەی ئەو سەودایە دەخەوێنم.

ئارەزووی من سەرکەوتنی ئازاد و ئارەزووە بەڵام هێشتا بۆ ئەو هەنگاوە زووە، ئارەزوو بە کوڕی حەمەخان بدەم.

هەرچی بێ، پێش هەموو ئیش و کارێک تۆ دەبێ خاڵی ڕوومەتی ئەو لاوە هەڵگری، ئەو خاڵە هەڵنەگیرێ ئەو لاوە دەگیرێ. نان‌خۆر و کلک شۆڕی، میری کەم نین ئێرەش سەرحەدە، چایخانەیە. ئاشنا و بێگانە، خاس و خراوی دێتێ، زار و زمانی خەڵکمان پێ‌نابەسترێ، دوای ئەوە دەبێ کارتی پێناسی ئەو لاوە بگۆڕین، گۆڕینی ئەو کارتە بەلامەوە سادەیە هەر دینار و درمی زۆری دەوێ، ئەویش هەیە و پەک ناکەوێ.

نازخانم فرمێسکی شادی هەڵدەڕێژێ. ئامێز لە مستەفا وەردێنێ و لاچاوی پڕ ئەوینی دەخاتە سەرسمێڵی و دەڵێ ئۆخەی مستەفا گیان. هەر دەڵێی لوقمانێکی دڵناسی. هەر دەڵێی گیانێکی بێ‌خەوشی، خولایی، خەوش و خاڵان لە سەر دڵی دڵ بە خەمان ڕادەماڵی. ڕوحم و بەزەو زانستی تۆ، بە هیوام،

دەرکی هیوامان لێوەکا و بە هەموو مرادانمان بگەیێنێ. ئێستا گومانم ڕەویـوە و سـوورم لە سـەر ئەوە کە خەونـی ئـارەزووی کچـم هـاتۆتە دی و بلـێ و مەڵێیەکی تێدا نەماوە.

هەژدیها کوڕی حەمەخانە و ڕێبوار ئەو لاوەیە و خەنجەر نەشتەرە کە لێرە بەو لاوە بە دەستی من لە خاڵی ڕوومەتی ئەو لاوە دەوەشێت.

مستەفا گیان دەبێ ئەو ڕازە شێراوە و لە ژێـر سەرپۆشـا داپۆشـراوبێت. نە ئارەزوو بزانێ، نە ئەو لاوە تێبگات، مەبادا ئەو لاوە غەوارە و لاوەکی بێ.

تەرە و پەرەوازەیەکی بێناوونیشان و نەناسیاو بێت. هەرچـی بـێ ئـێمە بە پێی توانا نازی ڕادەگرین و گیانی دەپارێزین بەڵام نازانم بـۆچی خۆشەویسـتی ئەو لاوە هەر دەم و دەست لە ناو دڵی منا هـێلانەی هەڵبەسـت. هەر دەڵێـی کوڕی خۆمە دوور نییە هەر لە خۆمان بێ و لە تایفەی خاڵـداران و بنەمـاڵەی مامەخان و باوەخانان بێ، هەرچێ بێ یاخوا بە خێر و بێـری مێـران و شـنگە پیاوان خۆ بناسێنێ، لە سۆرە و تۆرەی ناپیاوی دوور بێ و دڵسۆزێکی دەسـتی بگرێ و گرێ کوێرەی مرادانی بۆ بترازێنێ. لە زەماوەندی ئازادی خۆیدا خـۆی ببینێ.

(دووهەمین باس)

شەنگە و مامەخان:

شەنگە لە جوانمێرترین، ڕەگەزی هەمەوەندە. زۆر لە مێژە بە مستەفای قاوەچی ئاشنایە. تەنانەت لە پێکهاتنی زەماوەندی ناز و مستەفادا نەخشی دڵسۆزی شەنگە لە بیر نەکراوە، شەنگە دوو ساڵە خێزانی بە ڕەحمەتی خوا چووە. تاقە کوڕەکەی بە دەستی حاکمی ئەو سەردەمە لە دار دراوە. کوڕی شەهید شینی نەبڕاوەیە. شەنگە لەگەڵ زۆربەی بنەماڵەکانی زەربە وێکەوتوو ئاشنایە.

تەنانەت دژی میری، خلێنە و بلێنەیەکیش لە ئارادا هەیە.

شەنگە بە ڕووداوی بنەماڵەی مامەخان خۆشبینە ئەو بنەماڵە بێدەست و چەک و مەچەک نین. ڕەنگە بتوانێ لەگەڵ ئەو بنەماڵەدا دژی میری داو و تەڵەیەک وەڕازێنێ. شەنگە دەیەوێ بۆ حەج بڕوات، بەڵام قسەکانی مچە قاوەچی وەبیر دێتەوە کە گوتی شەنگە گیان زووتر سەرم لێ‌هەڵێنە کارم پێتە.

دەڵێم، ئەوساڵەکە لە حەج گەڕێم. کە خوا ڕێی دەستم بدا هەر هەنگاوێکی باشم بۆ خۆی حەجێکە.

شەنگە پووڵدارە. شێوەی ئاڵوێری ناوخۆ و دەرەوەی هاتۆتە دەس. بەو هۆیەوە ناسراو و ناسیاوداره بەڵام حەیف وەجاغکوێر و بێ‌پاشەوارە. خوشکێکی بێوەژنی بنەوانە، ئەویش مێردی لە دار دراو و شەهید کراوە. خوشکەکەی ناوی عەتییەخانە.

شێرەژنی خولی خۆیەتی. جوان و بە دیمەن و ورەبەرزە خوازبێنی زۆرە و بە شووی دوبارە ڕازی نییە. نایەوێ شەنگەی برای بەتەنێ وەمێنێ. عەتییەخان هەر ناوی ژنە، دەنا پیاوە، بۆ تۆڵە دەگەڕێ نەخشی شۆڕشگێڕی دەگێڕێ، شەنگە شاگردی ئەوە. بەشی زیاتر غیرەت و هومێد و هیوا لە دنە و گفت و لفتی خوشکی وەردەگرێ، شەنگە بەو خوشکەوە خۆ بە وشک و برینگ و بێ‌ماڵ و جاڵ نازانێ و دەتوانێ ئێرە و ئەوێیان بگەڕێ. شەنگە دوو سێ ڕۆژە گەڕاوەتەوە لای عەتییەخانی خوشکی دەستی بۆ هیچ ئیش و فەرمانێک ناجووڵێنێ، هەمیشە مات و خەیاڵاوی‌یە.

قسەی خۆش و بنەزمانەی بە تامی نەماوە، لە بچێ و نە چێی حەج دا تێگیراوە و خۆی بۆیەک لا نابێتەوە، ڕووداوی بنەماڵەی مامەخانی وە ڕووی خوشکی نەداوە، خوشکی ماران‌گەزتە و بنەماڵەوێران و هاوسەر کوژراوە. بێت و ئەورۆ، ئەو لاوەش ببینێ ڕەنگە ئەوەندەی تریش بەرەو سیسی بڕوات، هەرگیز ناشکرێ وەیشارێ. بنەماڵەی باوەخان و مامەخان ناودار و بۆ هەژار و بێ‌دەرەتان و داماوان زۆر بەرچاو و بەخێر و بیر بوون. بۆ هەر جێیەکی هەرێم دەچی ئەو باسە دڵتەزێنە لە سەر زار و دەمی خەڵکە، ڕۆژێک خۆی بەو باسە دەزانێ و لە من توورە دەبێ حەقیشی پێ‌دەدرێ، من بَرای ئەوم ناشێ چ دەردەدڵانی لێ‌وەشێرم.

شەنگە پۆنگی خەیاڵاتە، ماتە بە خەمە، دەستی لە ژێر چەنەیە، جاروبارە وەک وڕێنە بکات ورتێکی لە دەم دەردەپەڕێ هەر دەڵێی هێرش دەبا و سەرە ڕێگای لێ‌گیراوە، عەتییە تێگەیوە کە شەنگە دڵتەنگە و پۆنگاوی خەیاڵە.

حاڵی باش نییه، نایەوێ خوشکی هەست بە خەمی بکا و بە کەمایەسی و تێگراوی بزانێ.

شەوە، لە نیوە شەوِ بەولاوەیە، عەتییە تێدەگا شەنگە نەخەوتووە. خەیاڵ سەری لێهەستاندووە. عەتییە بەو شەوە لە کاکی وەژوور دەکەوێ، بە سڵاو و سەلیقەی خوشکانە دەستی لە دەستی خەیاڵ دەکاتەوە. پێی دەڵێ برام بەڵات گرم، بۆ ماتی؟ بێخەوی، لە قسەی خۆش پچڕاوی، من لە بەرێ و لە پشتێ هەر تۆم ماوی، بێنازیی تۆ مەرگی منە. بڵێ بزانم چتە؟ چی دڵی گرتووی، خەوی بردووی، زەردی هەڵگێڕاوی، لە شەنگی بڕیوی. شەنگەی جاران نەماوی باوێشکی وشکی بێباوی، وشکی هەڵێناوی، چتە؟! لە چت کەمە؟ بیری چتە؟ دەتەوێ چ بکەی؟ بۆ شاردووتەتەوە؟!

شت لە من وەشاری، نەنگە، نەزانییە، بە هەڵەچوونە کە من دڵسۆزی تۆ نەبم، ئەدی دەبێ کێ بێ، کامە کەسە، جیا لە من بۆتۆ کەسە، ڕەجایە لە من زیاتر کفرم دەرمەهێنە، زمانم پێ دەرمەکێشە، شەقاوێت ڕووداوت ڕاگەیێنە.

